تەنــەی کەبــەبینینت ســەرنجت لەســەریەتی، هــەوڵ   بدەجارێکی تر سەرنجت لەسـەر ئەوتەنــەبێت.دەبینــی بیرە نوێکان چین کەهەڵ دەقوڵێن لەهۆشمەندی بەرانبەریدا؟ کەبەشــی هەســتیار دەنوێنــێ لــەم تـاکیکردنــەوەدا، لەتواناتدا دەبێ لەسەر پاککردنەوەی هۆشت لەهەموو ئەو بیرانەی پێشوو دەربــارەی ئەوتــە نەلەکاتێکــدا تیایــا درێژەدەدات هۆشت بەوێنەکردنی بیرەکانت ڕێگای نوێیە بۆ بینینی ئەوتەنە یان ئەو کەسە کە لەئاستەکانی ترەوە دێت بۆ بوونەکەت( گەواڵەکەت ).

راهێنانی ژمارە ( ٣ ) لەسەرنج دانی ئاگایی کۆمەڵدا

بۆدانانی یەکێ لەدوانزە تەن یان پتر لەسێلێکدا وهەموویان داپۆشە ئە نجا دا پۆشەرەکە بۆماوەی سی ( ٣٠ ) چــرکە بەرزبکــەوە وچــاوی لێ بکــە چــی تیــادا هەیــە. ئــە نجا داییپۆشــەرەوە وتۆمــاری بکــە لــەوەی کــەیادت دێتــەوە لەبینینیدا....دوای ئەوە هەوڵ بدە تواناکەت لەیادهێنانەوەی شتەکاندا تاکی بکەیتەوە وتۆمــاری بکــەوە لــەوەی کەنەت توانیوە یادت بێتەوە.ئــەم ڕاهیێنانی،انــە نــاودەبرێ بەسروشــتێکی ڕۆیــشتنی تاییــەت کەلەچوارچــێوەی کۆمەڵەکەدا تەواودەبێ هــەروەها لەماوەیدرێژە پێــدانی ڕاهێنانەکانــدا تێبینیــەکان دەبینیتــەوە کــە پتر دەبــێ. لەهەرکەرەتێك دا کــە بەدرێژە پێــدانی پترەوەیــە.لێــرەدا ووردی دەخــوازێ، واتــە دەبــێ کە پێناســەیەکی ووردت هەبێ.ئە نجا دەشێ پەیرەوکردنی ئەوە بەچونە ناوەوە لەجێگایەکدا بێت، یان لــەژوورێکی نابەڵــەدابێت، پاشــان بەڕوانینێك دەگەیت لەهەرکەرەتێکدا کە لەسی چرکە تێپەڕ ناکات، پاشان هەوڵ بدە ئەوەی تیایــدا هەیــە یــادت بێتەوە یان هەر درێژەکاریەکی تر هەیە وەکو ژمارەی پە نجەرەکان ودەرگاکان  یان پــلاك وگڵــۆپی کارەبــایی یــان تەختایی ژوورەکە یان بنمیچەکە...تاد.

نموونەی ئەم تاکیکردنەوانە یارمەتیت دەدات لەسەر ئامادە بوونێك لەباوەڕت دا دەربارەی شتەکان کەلەشارەزایت بەهێز.دەکات لەتێبینی کردندا.ئێمە بەشێوەیەکی باشتر دەبینین کاتێك پەلە نەکەین لەوەرگرتنی بڕیاردا لەسەر ئەوشتەی دەبیینین وتێبینی دەکەین، واتە بەکامێرای تەلەفزیۆن دەچین کەوێنەی ژوورێك دەگرێت.شتەکان هــەموو تێبینی دەخوازێ بەبێ بڕیاردان لەســەری پــێش ئــەوەی کەکەســەکە بتوانــێ ئەوشــتەی ڕاســتە بیبینێــت.لێــرەدا نموونەیەك بڵێ لەکاتی پێشووی ژیا نمدا ڕوویدابێت لەمێش بیرم دەکــردەوە کەبێزارکــەر و زیــان بەخــشە چــونکە هەمیشە میکرۆبەکانی پێوەیە.کە ئەویش کوشتنیەتی تابەهەموو توانایەکەوە لێی دووربکەوینەوە.لەڕاستیدا هیچ ئارەزوویەکم نەبووە کەزانیاریم هەبێ لەسەر هەرپێناسەیەکی زانستی بۆ مێش یان بوونی کەڵکی بــێ لەسروشــتدا کەبەوەش داتەنهابەیەك لایەنیەوە پارێزگاریم کردووە ئەویش لایەنی خراپە کەلەکەســانی تــرەوە فێــری بــووم، بەڵام دوای خوێندنەوەی پەرتوکێك کەلە لایەن –ف. ئالمین دانراوە بەم ناونیــشانە ( kinship with all lite ) ئە نجا بڕیاری بەجێهێنانی تاکیکردنەوەیم دا: لەڕۆژێکیاندا لەژووری خەوتنمدا دەستم پێ کــرد، مێــشێکم بینــی

وچاوم داخست ورێگەم دابەمێشەکە تازۆرتر نزیك ببێتەوە تالەسەردەستم نیشتەوە.لەوکاتەدا بەشێوەی گشتی هەموو بیرکردنەوەکانی پێشووم دەربارەی مێش وەستا، ئەنجا سەرنجم لەتاکیکردنەوەکەمدا تەنها لەمێشەکە دەدا کەلەبەربەدەنم دەگەڕا.بێ گومان ئەستەمە زاڵ بین بەسەر خونەریتماندا کەلەمێش بێزاردەبین، بەلاّم کەبەتوانابووم لەوڕۆژەدا لەسەر دەرکردنی هەموو بیرەخراپەکان لەهۆشمدا ودەستم کرد بەسەرنج دان لەسەر هەنگاوە ووردەکانی مێشەکە، کەئەویش لەسەرە بەدەنم دەروات و بینینەکەم گۆڕا بەبارێکی بەکەڵك ومن چاوەڕوانی مێشەکەم دەکرد کەبەهەنکاوەکانی ناسکی لەسەر دەستم دەگەڕا،کەدەستم کردبە تەماشاکردنی مێشەکە لەگۆشەیەکی بوونی هاوڕێیەوە کەشتێکی کێز( قێز ) لێ هاتوو نییە، واتە من دەستم کرد بەهەست کردن و بەهەوانەوە و ئارامی. مێشەکەمایەوە لەسەردەستم بۆماوەیەك وسەرسام بووم بەو تاکیکردنەوە نوێیە دەگەڕا . هەروەها دوای ئەوە کەلەجێگەدا لەچاوەڕوانی خەوتن دا بووم گوێم لەگیزەی مێشەهاوریکەم دەبوو کەبەسەر دەم وچاوم دا دەگەڕێ ودەفڕێ.کەبێزاری کاردانەوەی یەکەمم بووم بەلاّم خێرا ئەوەی دووری خستمەوە گوێ گرتنم بۆ دەنگی مێشەکە بوو وەکو ئەوەی کەلە پێشدا نەم بیستبێ.کەئەو ئەزموونەی ترزۆر بەکەڵك بوو کەوابوو گوێم گرت بەبێ بڕیاری فەرمانی پێشینە یان سەر زەنشتێك یان هەر بیرێکی بێزارکەری پێشوو.ئایا دەشێ کەخەیاڵ بکەینەوە لەدەنگی مێشەکە وەکو ئەوەی مۆزیکایەك بەرگوێ بکەوێت؟ بەڵێ...ئەمە بۆمن دەستی پێ کردووە وخەم دایگرتوم کاتێ دەنگی مێشەکە نەماوە ووەستاوە.ئەنجا کاتێك دەستم کردەوە بەنرخاندنی تاکیکردنەوەکەم، ئاشکرا بووە بۆم کەمن هیچ نەکەم بێجگە لەشێتێکی ئاسان نەبێت کە پووختەدەکرێت بەدوور خستنەوەی بۆ چوونم وئامادە بوونێکی تری سەرلەنوێ....کەئەم کارەش ئاسانە لەسەر هەمووکەسێ کەلەتوانایدایە پێی هەڵبستێ لەهەرکاتێکدا کەدەربارەی هەرشتێك بێت کە بمانەوێ.

**خاوبوونەوە وشل بوون - Relaxation**

ئەگەر بۆدەرخستنی ناوەوەت ویستت وەلاّم بدەیتەوە دەبێ بەدەن و ئاوەزت لەخاوبونەوەدابێت.هەرچەندە کە ڕۆشنبیریمان وەستاوە لەسەر نائارامی کەئەستەم دەبێ لەسەرمان بچینە ناو باری خاوبوونەوەوە، بەلاّم ئەگەر هونەری خاوبونەوە فێرنەبیت ئەوا نەشیاوە شارەزاییەکانی دەروونت پەرە پێ بدەیت.ئەم ڕاهێنانەی کەوادێت یارمەتیت دەدەن لەسەر ڕزگارکردنی بەدەنت لەئالوزی ونائارامی وگەیشتن بەباری خاوبونەوە.

**ڕاهێنانی ژمارە-١- لەخاوبونەوەی تاك یان کۆمەڵ دا**

ڕێك بوەستە وهەردووباڵت بەئاراستەی سەرەوە بەرزبکەرەوە.هەوڵ بدە بە پێی تواناتت ماسولکەکەت توندبکەیت، پاشان کاربکەلەسەر خاوبونەوەی بەرە بەرە لەوکاتەدا کەکاری تیادا دەکەیت لەسەر نزم کردنەوەی هەردووباڵت بۆ باری ئاسایی وەرگێراو بۆ بارێك لەخاوبونەوەی تەواو.دوای ئەوە تێبینی بکە واتە لەماسولکەکانت کەدەمێنێتەوە لەباری ئالۆزی ونائارامی دا، ڕاهێنانەکە چەند بارەی بکەرەوە تاهەست بکەیت بەوەی کە ماسولکەکانت هەمووی لەباری خاوبونەوەدا یە.

## ڕاهێنانی ژماره -٢- لەخاوبونەوەی تاك وكۆمەڵدا

مەرجێك لە پێهەستانی ئەم ڕاهێنانەدا هەیە

كە دەبێ جل وبەرگەكان ڕەنگا وڕەنگ بێت لەسەر باندانیشك دانیشەو پێیەكانت لەسەر زەوی دابنێ و پێیەكانت لەسەر هەردوولای باندانیشەكەوە دابنێ ( كورسی ) ئە نجا ئەگەر باندانیشەكە یارمەتی دەرنەبوو، دەستت لەباوەشتدا دابنێ.كاچت ( قاچت ) لەسەر یەكتری دامەنێ یان دەستت لەسەر ئەوی تر لەبەرئەوەی نموونەی ئەم بارە ڕێگردەبێ لەمەزەندەكردنی ووزەدا. لەتەپڵی سەرتەوە تاكو بنی پێت دەستی پێ بكە بەومانایەی كەفەرمان بدەیت بەهەر بەشێك لەبەدەنت لەباری خاوبوونەوەی یەك لەدوای یەك دا.بۆ نموونە دەڵێیت هەست بكە كەجومگەكانت لەباری خاوبوونەوەدان، واتە هەموو ماندوو بوون و بێزاریەك نامێنێ بەوەی جومگەكانم سوك وخۆشە.هەست دەكەم كەسەرم لەباری خاوبوونەوەدایە كەهەموو بێزاریەك لاچووە لەسەر نێوچەوانم بەوەی كەسەرم وازی لێهێنراوە لەئاشتی وئارامیدا. یان دەڵێین هەست دەكەم كەچاوم لەخاوبوونەوەدایە لەگەڵ پێڵوەكانم وبرۆكانمدا، كەهەموو بێزاریەكی لەسەر لاچووە...من ئێستا بارگاوی بووم بەووزە وهەست دەكەم بەبوژانەوە. كەبەم شێوەیە درێژە دەدرێ تاهەموو بەشەكانی بەدەن بگرێتەوە تاماندوویی وبێزاریەكە ئاراستە بكرێ تەنها بەنەمانی كیچش بێت بۆ هێزی كێش كردن.ئە نجا لەو كاتەدا دەگەیت بەجومگەی پێكانت لەتواناتدا دەبێ ئەوەی كەماوە لەبێزاری وماندوویی لەسەر پە نجەكانتەوە دەریكەیتە دەرەوە. هەڵبستە بەم ڕاهێنانە وبەهێواشی و بەدەنگی ئارام وهەستیاری.كەئەم هەنگاوە لەسنوری خۆیدا یارمەتیت دەكات لەخاوبونەوەتدا.

**-هەناسەدان :-** هەناسەدانی لەبار بەبنەڕەتی دەژمێردرێ لەخاوبوونەوەدا. زانراوە كەخەڵكی بێزارو ماندوو بەشێوەی ڕواڵەتیەكی هاناسە دەدەن، بەڵام ئەوانەی لەباری خاوبوونەوەدان ئەوادەیان بینی بەكوولی هەناسە دەدەن. ئۆكسجین كەهەناسەی پێ دەدەین ووزەی بۆ هەموو بەشەكانی بەدەن هەڵ دەگرێ.لەكاتێكدا دووەم ئۆكسیدی پاشەرۆ هەڵدەگرێ بۆ دەرەوە كەماندووی لەكەڵەكەبوونی بەجێماوەكانی پاشەرۆیە.

هەناسەدانی لەبار دەست پێ دەكات بە پەردەی بەربەستەكە كەئەویش پێك هاتووە لەماسولكە لەژێر سیەكاندا كەهەڵدەستێ بەكرداری چوونەوە ناوەوەی.ئێستا فێردەبیت چۆن پەردەی ( زەمانەی ) بەربەست بەكاربهێنین بەشێوەی لەبار بۆ ئەوەی یارمەتیت بكات بەباشی هەناسە بدەیت لەبەدی هێنانی باری خاو بوونەوەدا.

### ڕاهێنانی ژماره -١- لەهەناسەدانی تاك یان كۆمەڵدا

دەستەكانت لەسەر هەردوو لای لە پی دەستت دابنێ بەوەی ئاراستەی پە نجەكانت بۆ پێشەوە بێت بێجگە لە پە نجەگەورەت كە بۆلای دواوەوە بێت. بەدەستت پەستان بخەرە سەرلە پی دەستت....هەوا بەكوڵی هەڵمژە، ئە نجا تۆ بەوە هەڵبستە وهەوڵبدە بەراكێشانی دەستت لە لە پی دەستت تا لەیەكتری جیابكەیتەوە كەئەوەش لەگەڵ جوڵەی زمانەی ( پەردەی ) بەربەستدایە.كەزمانەی بەربەست شێوەی لاروەردەگرێ بۆسەرەوە كەوابوو كۆتاییەكانی نزم بۆتەوە كەدەكەوێتە لە پی دەستەوە، كەئەمەش ڕوودەدات لەبەر ئەوەی سیەكانت فراوان بوون وبۆخوارەوە دەكشێن. كەلەوكاتەدا تۆ پاشەرۆت دەردەكەیت هەست دەكەیت كەلە پی دەستت دا پۆشراوە ( بەری گیراوە ).هەروەها تۆ ئەم ڕاهێنانە دووبارە بكەرەوە خەیاڵ بكەوە كەتۆ ووزەی هەواوە ( حەواوە ) ( ووزەی خاوبوونەوە ) هەڵدەمژی و ماندووی دەمارگیری دەردەكەیتە دەرەوە.

### ڕاهێنانی ژماره -٢- لەهەناسەدانی تاك یان كۆمەڵدا

دوای ئەوەی كەبەشێوەیەكی باش نزیك دەبیەوە بەهەناسەدانی زمانەی بەرەبست كاركەری دەنگی بۆ سەرباریكە كەكاتێك ليك دەرژێ دەمت دەبێ كراوەبێت، كەهەرچەندە دەنگت كوڵ بێت ڕزگاری دەبێ لەرێژەیەكی زۆرتری ماندوویی. تێبینی دەكرێ كەدەنگەكە پتر كوڵ دەبێ لەبەیەك گەیشتنی خۆیدا.بەراستی بەركۆیی وماندوویی هەبوو لەماسولكەكانتدا بەهۆی هۆشتەوە دەجوڵێ كەلەماوەی بەكارهێنانی دەنگتەوە، ئەوا سەرنجی ئاگایت دەدەیت لەچوارچێوەی بەدەنت دا نەك لەهۆشتدا.

### ڕاهێنانی ژماره -٣- لەهەناسەدانی تاك یان كۆدا

پە نجەكەت لەسەر لایەكی لووتت دابنێ ( واتە بەبابا نویل بچیت )، ئە نجا كونەلوتی ڕاست دا بخەیت وهەناسە بەكونەلوتی چەپ بدەیتەوە. هەردوو كونە لووتت دا بخە وهاناسەت ببڕە.دوای ئەوە كونەلوتی چە پت دا بخە وبەكونەلوتی ڕاست هەناسە بدە...كەتۆ هەڵدەستیت بەم ڕاهێنانە دەست بكە بەژماردنی ئە نجا هەناسەت ببڕە بۆماوەیەكی كاتی كەچوارهێندەی هەناسە وەرگرتن بێت ئە نجا خایاندن لەهەناسەدانەوەدا دوو هێندەی هەناسە وەرگرتن بێت....كاتێ ئەوەت بەهێواشی كرد ڕاهێنانەكە زۆرتر كاریگەر دەبێت .

### دڵنیا كەرەوەكان - Affiamations

دڵنیاكردنەوە بریتیە لەراگەیاندنی ئاشكرا. كەلەوكاتەدا دەڵێیت ( من زانای دەروونم ) ئەوا مانای دڵنیابوونەوەیە. یان دەڵێت ( من زانای دەروونی نیم ) دیسان بەدڵنیای كەرەوە دەژمێردرێ.دڵنیاكەرەوەكان ئەو بارانەن لەدەروونی ناوەوەدا. كەئاوەزی بەرنامەكراو دڵنیاكەرەوەكان بەبەرنامە دەكات كەهەمووشتێ بەباوەڕەوە دەڵێین ەهێزی سۆزداری بەدی دێت. كەدووبارە بەرنامەكردنی دەروونی ناوەوەت دەخوازێ لەسەر دڵنیاكردنەوەی باشی تایبەت كەتۆ خوت پێوە گرتووە و سالأنێك تێپەربووە لەسەر دڵنیابوونەوەی خرا پی چەندبارەبووەوە كەبەسوور بوونەوەبێت.ئەوا

لەوكاتەدا بەئاگایی ئەوەی دەیلێین یان بیری پێ دەكەینەوە دەیلێین، سەرسام دەبیت بەوشەی كەدەیلێیت وبیردەكەیتەوە.

ئه نجا هەرچەندە تێبینی خراپت كردبێ پشتیوانی بكە بەدڵنیاكردنەوەی باش..كەبۆنموونە پشتگیری دەربڕینی ( ئەمە گەوجیيە ) بكە بەدەربڕینی ( فێردەبم لەئەزمونی نوێمەوە ). دڵنیایەكەت بنوسەرەوە.بەراستی هونەری نوسینی دڵنیابوونەوە یارمەتیت دەدات لەسەر سە نجدانت لەئاوەزی بەرنامە كراوت دا.

ئەم داڕشتنە بەكاربهێنە وڕای بگەیەنە بەدڵنیاكردنەوەیەك كەئارەزووی دەكەیت وەكو ڕاستیەكی ئامادە. كەئەویش ڕاستیەكی ئامادەیە لەسەر ئاستی ئاوەزی، بەڵام لەماوەی سەرنجدانی یەك لەدوایی یەكەوە لەسەر تێكەوتنی دا لەسەر ئاستی ئاوەزیە. كەئەوەش بۆی خۆش دەبێ بۆ ئەوەی ڕاستیەكی مادی بێت.یەكەم دەست پێشخەری بەكاربهێنەو بانگهێشتی بكە كەبەشێكە لەكەسایەتیت ولەژیانت. یادبكەرەوە كەناهۆشمەندی هیچ نابەدڵیەك نانێرێ لەسەر ئەوەی دەیدەیتێ، ئەویش بەئاسانی هەمووشتێ پەسەند دەكات.دوور بكەوەوە لەوەی كەخۆت لەبەراووردكردن لەگەڵ خەڵكیدا دابنێی یان لەشوێنەكاندا یان بارودۆخەكان لەبەر ئەوەی بەئاسانی دەكشێت لەسەر ململانێ یان ئاستەكان لەبەدەست هێناندا كە پەیوەندی نی یە بەناهۆشمەندیەوە.

كەلەدەربڕینەكانی خراپ دوور دەكەویتەوە لەوانەش ( نەخێر ) و( هەرگیز ) كەزمانی تایبەت بەناهۆشمەندی بۆ ئاوەزی بەرنامەكراو خرا پیەكان نازانێت.كەلەكاتێك دا ڕێژەیەكی گەورە لەووزەی سۆزداری دادەنێیت لەشتێكدا كەناتەوێت یان دەت ترسێنێ .كە ناهۆشمەندی بەكارنایەت بێجگە لەو ووزەیە نەبێت كە بۆ سەرنجدانە لەسەر ئەزمونەكان كەرکت لێی دەبێتەوە یان لێی دەترسی.

كە ناهۆشمەندی بێجگە لەو ووزە بۆ سەرنجدان ئەبێ بەكاری ناهێنێت لەسەر ئەو ئەزموونانە كەدەتەوێت لێ دوور بكەویتەوە. ئه نجا ووشەی ( نەخێر ) كەڵكی لێ وەردەگیرێ لەهەردوو باری نەهی وڕێگری كردندا. ڕێگەلەدەروونی ناوەوەت مەگرە لەكاری شتەكاندا كەرکت لێ یەتی یان لێ دەترسی.ئه نجا لەجیاتی ئەوەش دەروونی ناوەوەت ئازد بكە بە پێدانی ڕاگەیاندن لە كردنی ئەوشتانەدا كە هەزت لێیەتی، كەئەویش بەڕۆڵی خۆی هەموو ئەوەی دەتەوێ پێی دەدەیت.لەوێندەرێ چیرۆكێك هەیە دەربارەی كەسێك كەزۆ پای ( علائەدین ) ی دۆزیەوە ناسیویانە وگوێیان لێ ڕاگرتووە هەروەها كاتێ دەنگێكی لێ دەرچووە تابڵێیت ( گەورەم ئەوەی دەتەوێت داخوازی بكە، من لێرە لەگوێڕایەڵتدام، داواكاری یەكەم پاڵتۆیەكی نوێ بوو پێش ئەوەی دەنگەكەی نەمێنێ بۆ بەدەست هێنانی پاڵتۆكە پیاوەكە هاواری كرد ( چاوەڕێ بكە ) من پاڵتۆم ناوێ بەڵكو دەمەوێ لەهاوای بژیم، دوای ئەوەی دەنگەكەی دا بەبردنی بۆهاواری، جارێكی تر وەستاندیەوە وداوایەكی تری لێ كرد...بەكورتی ئەوكەسە نەیزانیوە داخوازیەك داوابكات تابگەڕێتەوەو بۆ چوونەكەی بگۆڕێ، كەجوڵەی لێدوان كەر وەكو پیاهەڵدەرێك دێت ودەچێت بێ ئەوەی شتێك بەدەست بهێنێ. كەلێدوان كەر بەگێڕانەوەی دەروونی ناوەوە دەگوترێ، كەزۆربەی خەڵكی نموونەی ئەم خزمەتكارە بەهێزە بەدەست دەهێنن كەدەجوڵێ بەبێ ئەوەی هیچ ئاما نجێك بەدی بهێنێ...كەئەویش هەوڵی

خەباتێکە کەیارمەتی خاوەنەکەی دەدات، بەڵام وەڵامی دەداتەوە لەکاتی هەر گلۆربونەوەیەکدا .ئەنجا بۆ دوورکەوتنەوەش لەوە پێویستە کەجێگیربێت لەدڵنیایی کەرەوەکانتدا .دەست بکە بەڕیزبەندی کردنی دڵنیایی کەرەوەکانت وئەو دڵنیایی کەرەوانە بگێڕەوە کەئارەزووت لێ یەتی و تیایا روونیت وپەیوەستیت لەماوەی بڕیاردانی ئەوەی کەدەتەوێت زۆرترە لەوانی تری. ئەگەر هەرئارەزوویەکی لاوەکی ودووەمی چووە ناوەوە لەگەڵ ئارەزووی سەرەکیدا ئەوا بۆتۆباشترە کەدەری بکەیت.لێرەدا هەندێ نموونەی نوێ هەن لەسەر هەندێ لەدڵنیایی کەرەوەکانی بەکەڵك لەوانەش :-

١) من لەچوارچێوەی کێشی ئارەزووکراوم تیادا –( بەکەڵکە بۆئەوانەی کەئارەزوو دەکەن لەدابەزاندنی کێشیاندا ).

٢) پێویست بوونی دوو سیپەلاك ( سیەکان ) بە پاك خاوێنی.( بەکەڵکە بۆئەوانەی کەئارەزوو دەکەن لەوازهێنانی جگەرەکێشاندا ).

٣) هەموو ئەوەی داخوازی دەکەم وبەکاری دەهێنم لەلامە. ( بەکەڵکە لەکاتی بەجێ گەیاندنی تاکیکردنەوەدا ) .

٤) هەمیشە هەست بکەبەوەی کەبڵێی من گرنگ وبەکەڵکم .( بەکەڵکە بۆهەموو شتێ کەلەسەر ئامادەیی هەمیشەیی یە ).دڵنیایی کەرەوەکانت بەباوەڕومتمانەی تەواوە وەبەرپەرچ بدەوە کەهێزێکی سۆزدارییەو گرنگیەکی تیادا دادەنرێ بەڕێژەی گرنگی ووشەکان خۆیان. هەروەها ئەوەی دەیکەین گیرانەوەی بەرنامەی ناهۆشمەندیە.ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بابەتە لەکەرتی هەفتەمدا لەم پەرتوکەدا.

راهێنانی ژمارە-١- لەدڵنیایی کەرەوەکانی تاکەکەسی

ڕووپەرێك دابنێ لەدە ( ١٠ ) دڵنیاکەرەوەی پاش پێك هاتبێ دەربارەی خۆت وتواناکەت لەسەر ڕاهێنانی شارەزاییەکانی دەروونیت .دوای ئەوە ڕووپەرەکە بەدەنگی بڵند لەبەردەم ئاوێنەدا بخوێنەوە.کاتێك بەسەر بەرە بۆچەند بارەبوونەوەی دڵنیای کەرەوەکانت تاوەکو ئەو ووشانە بەدی بێت کەلەسەر خۆدت دەیڵێیت.

پێویستە کە ووشەکان دەربڕینێك بێت لەوەی کەدەتەوێ ڕاست بێت بەوەی کەتۆ لەوکاتەدا دەیخوێنیتەوە بەدەنگی بەرز، ئەوا تۆ بەهەست کردنی ڕاستینە بەوە هەڵدەستێ.

**ڕاهێنانی ژماره -٢-لەدڵنیاکەرەوەکانی تاکە کەسیدا**

**سێ گرفتی هەنووکەیی لەژیانتدا پلە پلە بکە کەدەتەوێ بیان گۆڕیت، دڵنیاکەرەوەیەك بنوسە بۆهەریەکێ لەوگرفتانە، ئەنجا دەری ببڕە دەربارەی بەڕێگەیەك وەکو ئەوەی بارێکی ئارەزووکراوە تیایا وەبەکردەوە بەدەست دێت.بۆنموونە هەمیشە هەست دەکەیت بەوەی کەتۆ زۆرجار گومانی خراپ دەکەیت، واتە تۆ تێ نەگەیشتوویت. بەڵام دڵنیایی باش بۆ ئەم بارە ئەوەیە کەمن هەمیشە دەربارەی خۆم دەری دەبڕم بەڕوونی وبەشێوەی ڕاستە وخۆ وتێگەیەنراو.**

**گرفت وئاریشەکەت بڵێ بەوەی کەدڵنیاییەکەت ڕاست و وورد بێت لەچارەکردنی ئاریشەکەدا.ڕووپەڕێك بەتەنیشت جێگەکەتەوە دابنێ ودڵنیاکەرەوەکان بخوێنەوە پێش چوونە خەوتەوە، پاشان جارێکی تربیخوێنەوە لەبەیانیاندا لەکاتی لەخەوهەستانتدا.ئەنجا خوێندنەوەکە هەموو بەیانی وشەوێك بگێڕەوە هەتا دڵنیایی کەرەوەی ئارەزووکراو لێ بەدی دێت.**

## وێنە بەرداری کردن –وێناکردن

**ئاوەزی بەرنامەکراو لەسەر ڕێڕەوێکی گەورەترە بۆ نامەکانی نازارەکی لێەوە وەڵام دەداتەوە بۆ دڵنیاکەرەوەکان. کەئەمەش هۆی نزیك بوونەوەی ووزەی سۆزداری لێك دەداتەوە بەدڵنیایی کەرەوانەت کەبە پێناسەیدا یەکێك لەڕەگەزە چالاکەکانە.هەروەها وەکو ئەوەی لێك دەدرێتەوە دەسەڵاتێکە کەلێمان ڕوو دەدات لە نامەکانی نازارەکی دا بۆکەسانی تر کەئەوەش دێت لەڕێگەی زمانی بەدەنیانەوە یان بۆڵە بۆڵ ودەنگ لێوە هاتنیانەوە بێت. هەروەها ڕەنگە دڵنیایی کەرەوەکانت بەهێزتر بێت ئەگەر توش بوویت لەماوەی بەناهۆشمەندی وێنەیەك هەروەکو لەبارەیەوە دەدوێیت.دەشێ ئەوە بکەیت لەماوەی وێنەی مادی زیندووەوە کەکەرەستەکە زۆرتر کاریگەر دەبێ ئەویش پێك هێنانی وێنەیەکە لەچاوی ئاوەزدا کەئەم دەربڕینە پێی دەگوترێ ( وێنەبەرداری کردن )**

**دەبێ وێنەبەر داری کردن لەهەموو هەستەکان پێك بێت کەنەك بەتەنها هەستی بینین بێت..چونکە ئەوەش زۆرتر چالاك بەدیاردەبێ.خەیاڵ بکەوە لەشتێك یان لە بارێك کەدەتەوێت، ئەنجا وێنە بەرداری بکە کەبارەکە چۆن دەبێت کاتێك پێی دەگەیت؟ ئەنجا بەخۆت چۆن دەبیت؟ هەست پێکردن چۆن دەبێت؟ ئەو دەنگانە کامانەن کەلەکاتی بەدەست هێنانی شتێکدا دێنە ناوەوە کە ئارەزووت لێی نیە؟ چێژو بۆنەکان...تاد چین؟ بەکورتی هەستەکانت هەمووی دابنێ لەچوارچێوەی وێنە وبەرداری کردنی ڕووندا دەربارەی شتێك کەئارەزو وهەزت لێ یەتی کە لەوکاتەدا ناشێ بۆ ئاوەزی ناوەوەت هەڵە بکات.هەندێ لەفێرخوازەکان هەست دەکەن کەوێنەبەرداری زۆرگرانە،بەڵام لەڕاستیدا وانی یە. ئەو شتەی کەکاردەکات ئەویش وێنەبەرداری کەری دروستکەرە، جالەسەر ئامادەکردنی وێنەکان بێت یان بیرەکان بێت تەنها ناسینی دەبێت کاتێك هەوڵ دەدەیت وێنەبەرداری و وێنای**

شتێك بكەیت، لەهەنـدێك كاتـداخۆت دەبینیتـەوە كەدەسەلأتت لەدەست دابێت لەسەربیرەكانی نەخوازراودا كەلەناو هۆشمەندی دا گۆگز ( قۆقز )دەبنەوە و بەدیاردەكـەوێ. كەئـەویش لەڕاسـتیدا ڕێگـری لەسـەرنجدانی ئاگایت دەكات و بیرۆكەشلار دەكاتەوە یان دەیپوكێنیتەوە كە لەسەرتە لەخەیالّ كردنەوەتـدا كـەرەت لـەدوای كەرەت درێژەبدەیت.

ئەم ڕاهێنانەی كەوادێت یارمەتیت دەدات لە پەرە پێدانی شارەزاییەكانتدا لەوێناكردندا :

سێ كارتی سپی بۆبەكار هێنانی لەوێنەكێشانی هەندێ نموونەدا پێنوسی ڕەش ی نـەرم بـەكار بهێنـە.لەسـەر كارتی یەكەم وێنەی بازنەیەكی سپی بكێشە لەگەڵ خاڵێكی سپی لەناوەڕاستیدا، پاشـان دواوەی تاریـك بكـە بەڕەنگێكی تۆخ.كەكاری ئەوە وێنە كێشانی بازنەیەك دەخوازێ بەچواردەوری خاڵەسپیەكەدا.هەروەها لەكارتی دووەمدا وێنەی خاچیكی سپی لایەكسان بكێشە ودواوەی تاریك بكە بەڕەنگی ڕەش. ئە نجا لەسەر كارتی سێ هەم وێنەی سێگۆشەیەكی سپی لایەكسان بكێشە بەمەرجێك لوتەكەی بۆسەرەوە بێت ئـە نجا دواوە بـەتاریك ڕەشـی بكە.هەموو ئەو نموونانە بەهەمان ڕێگە ڕەنگ بكە واتە بەتاریك كردنی دواوە یان ووازلێهێنانی وێنە سپیەكە.

هەروەها ئەگەر ئارەزووت كرد ئەوا لەتوانتدا دەبێ ئەو وێنانە ببڕی لەكاخەزێكی سپیدا وبیلكێنـە بەكاخـەزە ( كارتە ) ڕەشەكانەوە.ئەو نمونانەش یارمەتیت دەدات لەسـەرفێربوونی وێنـە بەرداری،كەئـەویش لەوكاتـەدا گرنگیەكی گەورە بەدەست دەهێنیت لەبەر ئەوەی ماناكەی پتر ڕوون دەبێتـەوە بـۆت هەرچـەندە كـووڵ بێتـەوە لەبەكارهێنانیدا. هـەروەها ئەگـەر ئاسـتەنگیت بـەرەو ڕوو بـۆوە بەبـەكارهێنانی كارتـەكان، وێنـەی هـەر نموونەیەك لەو نموونانە بكێشە بە پە نجەت لەهەوادا، یان وێنـەی بكێـشە لەسـەر یـەكێ لەلـە پی دەسـتت بە پە نجەكانی تری دەستت لەوكاتەدا بەڕوانین بۆی تیابەردەوام دەبی.كەئەمەش ڕەگەزی بەركەوتن بـۆكرداری وێنەبەرداریكردن زۆرتر دەكات.هەروەها دوای ئەوەی ئامادەیت بۆ دەست پـێ كـردن ئـەوا یـەكێ لەكارتـەكان هەڵبژێرە بەتەماشاكردنت سەرنج بدەلەسەری بۆ چەند خولەكێ. ئە نجا لە پاشاندا چـاوت دا بخـە وچـاوەڕێ بكەچی ڕوودەدات.كەلە پێ هەستانی درێژەدەرەوە وێنەیەكی پێچەوانە دەبینی بۆئەو نمونەیەی لەبەر دەمتدایە كەئەوەش بەهۆی بینینی ناوەوەت ڕوودەدات واتە بەهۆی ڕوانینەوە ( بەچاوی ناوەزت ) كەلەسەرت دایە.درێژەبدە لە پێهەستانی ڕاهێنانەكە لەماوەی بەكارهێنانی هـەردوو كارتەكـەی تـرەوە وبەهـەمان شـێواز سـەرنج بـدە بەڕوانینت لەسەر وێنەكە. پاشان چاوەكانت دا بخە وتادەگەیتە دوورترین وێنەبەرداری كەلەناوسەرتدا تـەواو دەبێ. دەشێ بەجێ هێنانی ئەو ڕاهێنانە بەشێوەی خێرابێت لە هەمووشەوێك دا بەوەیكە دەتوانیت تواناكـەت تاكی بكەیتەوە لەبەرە پێداندا لەوێنەبەرداری كردنی هەموو ڕۆژێك دا. هەمیشە سەرسوڕماویت كەچی دەبینیـت هەیە لەناو سەرماندا.

ئەم ڕاهێنانەش یارمەتی دەدات لەسەر پەرە پێدانی هێزی مێشكت بۆ گواسـتنەوەی وێنـە بـۆ نـاو پێـشی سـەر وهۆشت.

# پارێزگاری کردنی کەسیەتی

وەکو ئەوەی بڕیاردەدەیت کەسێك ڕێگەبدەیت بەهاتنی بۆ ماڵەوەت، بەهەمان شێوە لەتواناتدا دەبێ کەبڕیاربدەیت ڕێگەبدەیت پێی تا بێتە هۆشمەندیتەوە. پێویستە کەیادی خۆمان بهێنینەوە تا زاڵ بمێنینەوە بەدرێژایی کات. زۆرجار هەندێ کەس پێم دەڵێ (لەوێنەدەرێ دێو وجنۆکە لەماڵەوەم هەیە ونازانم چی لەبەرانبەریدا بکەم) کەکاردانەوەم بۆیان ئاسایی یە و دەڵێم (ئایا پرسیارت لێ کردووە کێ دەبێ وچی دەکات لێرەدا) دەڵێن (نەخێر) ئەنجا من دەڵێم (بۆچی نا) لەتواناتدا دەبێ ئەوە بکەیت ئەگەر ئەوکەسە بەبەدەن نوێنراوە بۆچی ئاوابوونی بەدەن جیاوازی دەبێ؟).

ئێمە هەموومان دەروونێن وشارەزاییەکانمان پەیبردن ودەرخستنە بەدرێژایی کات کاریکردووە سەرەرای ئەوەی زۆربەمان ناهۆشمەندین بەشێوازە ووردانەی کەلەماوەیەوە یەکێکێمان دەروونی کارلەوی ترمان دەکەین. ئەنجا هەندێ لەو دەست تێوەردانانە بەهەمان ڕێژە لەووردی نیە فەرمانەکان ولیکدانەوەکان وبیرەکان گەڕاونەوە بۆ ئەوانی ترکە لێیەوە دەرنابڕدرێ لەهەندێ کاتدا بێجگە بەزمانی بەدەنی نەبێت کەلەسەر ڕێچکەی نەستە، توانای هەیە لەسەر گیرسانەوە لەناهۆشمەندی داکە بنەڕەتی لەوێندەرێیە. هەروەها کەباری پەستی وبەجێهێنانی خۆراگری بۆکەسێك کەلە پاشتەوە دەوەستێ لەدیوارێکدا دەشێ کەلەسەری بکشێیتەوە. هەروەها ئەگەر دەروونی ناوەوەت بیرو باوەڕە خراپەکان هەڵبگرێ، ئەوا پەلکێشت دەکات بۆ بارێکی سەرزەنشت کردن لەسەر خولیای خراپ بۆکەسانی تر. ئەنجا لەجیاتی ئەوەی ئامانجێك بیت بۆ ووزە زیان بەخشەکان لەتواناتدایە کەخۆت بپارێزی وشێوازی بەرگری کردن فێرببیت لەخۆتدا بەڕێگەیەکی دەروونی. کەباشترین شێوازی پاسەوانی وبەرگری کردن پێك دەهێنێ ئەویش ئاراستەکردنی پرسیارە بۆ ئاوەزو کەم لەگومان بەتەندروستی دەژمێردرێ. بەلام لەوکاتەدا گومان لەگەڵتدایە، کەفەرمانەکە بەڵگە دەخوازێ .....کەناشێ خۆت بیدەیت بەدەستەوە بۆ ترسی تایبەتت. هەروەها دڵنیاکەرەوەکان لەسنوری خۆیدا پاسەوانی هەروەها بەرگری باش دەرەخسێنێ. وەکو ئەوەی دەڵێیت (من کراوەم بۆهەرچیەك باشە هەروەها داخراوم بۆ هەرشتێك کەئارەزووم لێی نیە). یان (من بەسەرپەرشتی خودا پاسکراوم) کەبەم دڵنیایی کەرەوانە کارتێکردن لەبەرگری کردنت دەبێ. کەلەبیرەباشەکانەوە دڵنیایی کەرەوەکانمان بەووشە تایبەتەکان دەگێرینەوە کەبەووشەدا هەست بەئاسودەیی دەکەین کاتێ بەرپەرچی دەدەینەوە. هەروەها لەهۆکارەکانی بەرگری تر چواردەورەدانی خۆمانە بەڕووناکیەکی سپی درەوشاوە. دڵنیابوونەوەیە لەدرێژبوونەوەی درەوشانەوەی سپی لە پشتتەوە وەکو ئەوە وایە لەبەردەستتدا بێت. بەڵکو لەژێر پێتەوە بێت. کەلەجیاکەرەوەکانی ڕووناکی سپین توانایەکە لەسەر لابردنی هەموو ئەوەی کەخراپە لەبەر ئەوەی کاردەکات وەکو دا پۆشەرێك. لەسەر هەربارێك بێت ئەگەر یادت بێتەوە لەهاوسەنگی یەکی تەواودا لەهەمووکاتەکاندا، کەڕەخساندنی پاراستنی دەروونی بۆخۆت کێشەیەك

نابێت.ئێستا تۆ لەهۆشمەندیدایت پێویستت بەسەرنج دانی ئاگایت هەیە لەگەڵ لابردنی بیرەکانی هەڵواسراودا وهەناسەدان بەشێوەی باش ودڵنیایی کردنەوەی تواناو شایستەی تاکانەتە ( تاقانەت ).لەسەرتە درێژە بە پێ هەستانی ئەو شتانە بدەیت تاوەکو دەگەیتە کۆناخێك کە بەسەرنج دانی ئاگایت ئەوشتانە پێویست ناکات.هەروەها پێش جوڵانت بەرەو کەرتەکانی تر، دەبێ ئەو شتانە دەبێ خاوەن سروشتێکی دووەمی سەبارەت بەخۆت.هەبێ دەبێ کەلەئەستۆت گرتبێ بەشێوەیەکی باش هەرچیەك کە پێشکەشی دەکەیت.

## کەرتی چوارەم

## بارەگۆڕاوەکانی نەست

پەرەپێدانی شارەزاییەکانی دەروونیشت پشت دەبەستێ لەسەر تواناکەت لەگۆڕانی وویستانەی نەستدا. تۆلەڕاستیدا، لەچوارچێوەی بارە جۆراو جۆرەکاندا کاردەکەیت جائەگەر تۆئەوە هەست بکەیت یان نا. ئەم کەرتی چوارەمە ڕوون کردنەوەیەکت بۆ خۆش دەکات بۆ ئەوبارانەی کەبەکاری دەهێنی بەکردەوە لەگەڵ چۆنیەتی وەرگرتنی دا. هەروەها کەبۆت ڕوون دەبێتەوە بۆت بارەکانی تر کەلەسەر ڕێڕەوێکە دەتوانیت لەگەڵیدا پێی هەڵبستی و پەرەپێدانی تواناکانت تیادا پەرە پێ بدەیت.

دەشێ پێناسەی هەست بکەیت بەوەی باریکە کە لەوکاتەدا هەمووبەشەکانی ئاوەزی لەچالاکی تەواودان...کەهەمووشتێ گۆڕاوە بۆ ئەوە، ئەویش باریکی جیاوازە یان گۆڕاوە لەهەست کەلەنێوان ئەوبارە گۆڕاوانەشدا بۆ هەست ئەوا تیژکردنەوەی هۆشە وخەونەکانی بەئاگایی یە لەگەڵ خەونەکانی شەودا، کەبارەکانی خەواندنی موگناتیسی وڕامان یان بەناخدا چوونت.ئێمە ( ڕۆژانە ٢٤/کاتژمێر لە نموونەی ئەم بارەگۆڕاوانەداین کەبەڕاستی ئێمە لەباری بەئاگایداین. کەکاتێك ماندوو دەبین لەکارێکی سەرپێی وڕۆتینەدا وەکو لێخوڕینی خودرۆ یان سەرپەرشتی کردنی باخچە یان لە شۆرینی دەفری چێشتدا کەتۆلەوکاتەدا ڕێگەنادەیت بەهۆشت ( گەران بکەیت ) بەلام بۆ کوێ؟ لەڕاستیدا بۆهیچ جێگەیەك ناڕوات، کەفەرمانەکە بەئاسانی یە ئەویش ئەو سەرنجدانەیە لەسەر شتێك دادەنرێ و پەیوەست نیە بەکارێکەوە کەتۆ تیاکاتت بەسەر بردووە. بەڕاستی خەونەکانی ئاگایی هونەری گۆاستنەوەی خۆتە لەوبارەتدا ( ئەوەی کەهەیە ) بۆ دانانی لەجێگەیەکی تری جیاوازدا.بەراستی ئەوەش هەڵهاتن نی یە لەرۆژەڤ ( ڕاسال ) کەتۆتیایدایت بەڵکو تۆکارێکی گرنگ بەجێ دەهێنی بەئامانجی پاراستن لەسەربارێك لەهاوسەنگی لەنێوان دەروونی دەرەکی و دەروونی ناوەکی دا.کەئامادەکردنی خەونەکانی ئاگایی هەلێکە بۆ پەرەپێدانی شێوازێك کەدەتەوێت بۆ ئاییندە.بچۆرە ناوەوە لەهەندێجاراندا لەگفت وگۆ ودانوساندندا یان لەمشت ومڕی ئاوەزیانەدا لەگەڵ کەسێکی تردا کەتۆچویت بۆبینینی واتە تۆ هەڵ دەستیت بەکاری ڕاهێنان بەرلە پێش وازیکردنی، کەلەتواناتدایە چەندان کەرەت و ئەوە بگێڕێتەوە ئە نجامەکانی گۆڕابێت و لەسەر ڕێڕەوێك بیت لەتواناتدابێت ئە نجامێکی خوازراو بەدەست بهێنی لەکاتی چوونە ناو مشت ومڕت دا یان لێدوانی ڕاستینەدا.

کەهەندێ لەخەونەکانی ئاگایی ناودەبرێ بەبوونی دابەدیهێنانێك بۆ ئارەزووەکان دەبێ کەلەوکاتەدا هەزت بۆ شتێك دەچێت ( ئاسایی دەبێ خواستنی گران بێت ) کەخەونەکانی ئاگایی کەرەستەیەك دەبن بـۆ بـەدیهاتنی ئەو ئارەزووە، واتە بەدانانی بژاردنەوەی ئەوەی لەدەست دراوە، کەبەوەشدا هەست دەکـەیت بـەبارێکی باشتر لەباری ئەو لەدەست دانەی کەتۆ لەسەریت. ئە نجا کاتێك ئاگایی بۆ خەون پەیوەندی بەشتێکەوە دەبێت شایستە بێت بۆ بەدیهاتن واتە فەرمانێك بێت خواستی گران نەبێت لەوکاتـەدا پێـی دەگـوترێ ( وێنەبـەرداری کردنـی خەیاڵی ) بەراستی توانالەسەر وێنەبەرداری کردنی خەیاڵی ) کـەڵکی دەبـێ لەبـەدیهاتنی ئـەو مەبەسـتانەدا کەبۆی هەوڵ دەدەیت. ئەوا تـۆ ئـەوەی دەتـەوێ بەدەسـتی دەهێنـی لـەماوەی سـەرنجدانی ئاگایتـەوە لەسـەر ئامانجەکەت کەلەدوای ئەوە ووزەی کردەوەیت بەرەو ڕووی ئاراستە دەکەیت. کەلە پاشـاندا، لەسـەرتە ئـاوەزی پێویست بۆ گێرانەوەی ئەو ئامانجە ڕاستینەیە هەڵدەبژێریت. کەزۆربەی کەسەکان هەژارن لەسەرنجداندا نـەك لە کردەوەدا. کەزانراوە باری وێنەیەکی ڕوون لەکردنەوەکـە بنـەڕەتی دەبـێ بۆبـەدیهاتنی کەئـەوەش لەسـەر کەسانی تر پەیڕەو دەبێ کەخەیاڵێکی بەفەر بەدەست دەهێنن و توانایـان دەبـێ لەسـەر دروسـت کردنـی وێنـە بەرداریـەکانی ئـاوەزی ڕوون وجیـاکراوە... کەبەوەشـدا ئـەوا بـەختێکی زۆریـان دەبـێ لەبـەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا، ئوانەی کەهەژارن لەخەیاڵ کردنەوەی بەفەڕو پیت دا.

هەروەها لەماوەی سەرنجدانەوە پـتر لەسـەر خەونـەکانی ئاگـایی کەئاراسـتەی کردنـی. بـەرەو بـەدیهاتنی ئامانجەکانتدەبێ، کەشارەزاییەکانت لەوێنەبەرداری کردنی خەیاڵیدا پەرە دەستێنێ بـەڵکو کارکـەرێك پێـك دەهێنێ و یارمەتیت دەدات لەگەشـە پێدانی شـارەزاییەکانی دەروونـی و پەرە پێـدانی دا. بـەڵام هـۆش بـڵاوی، کەبارێکی خرا پە لەخەونەکانی ئاگایدا. کەڕوودەدات کاتێك هۆشت لەباری بەتاڵیدابێت، کەلەوکاتەدا ئارەزوو نامێنێ لەبەکارهێنانی ئەوبارەدا بەشێوەیەکی بەردار، کەوابوو هەڵواسراو دەمێنێتەوە لەنێوان کۆششی بەدەنی وکۆششی ئاوەزی دا. هەروەها بڵاوبوونەوەی هۆش ڕوودەدات کاتێك ئارەزوومان ئـەوگرنگی نەدانەیـە کەبـە لـە چواردەورماندا دەسورێتەوە. واتە ئێمە هەڵی دەبژێرین کـە بـێ ئاگـادەبین لـەکاتێکی ناتـەواودا، کەئـەوەش ئەو پەڕی ئاست لەووزەدا دەنوێنی.

هەروەها باری ئامادەیی هۆش پێچەوانەی باری بڵاوبونەوەی هۆشە ( بیربڵاوی —وەرگێر ) کەئامادەبوونی هۆش ئەو توانایەیە لەزاڵ بوون بەسەر هۆشدا کەلەسەر ڕێڕەوێك بێت دووری بخاتەوە لەکارکردن بەهەرپرسێکی تربێـت بەدەر لەباری خواستراو کەئەویش باریکە ڕێگەبەخاوەنەکەی دەدات ووزەکەی چالاك بێت تایارمەتی بدات لەسەر پەرە پێدانی تواناکانی هۆشی وزاڵ بوونی لەسـەر هـۆش و بیرکردنـەوەی کەئـەوەش لەوچـرکانەدایە کەئـەو دەیەوێت... کەوەکو ئەو خەونانەی ئاگایی وایە شێوەکانی جیاوازن، واتە شوێن کەوتنێکە بۆپێویستیەکەت کەبۆ خەونەکانی شەو شـێوەجیاوازەکان هـەن. لـەدەمی خەوتنـدا خەونـەکانت هەڵدەسـتن بەهـەمان کاروفرمـانی

خەونەکانی ئاگایی،واتە یارمەتیت دەدەن لەسەر پاراستنی بارێك لەهاوسەنگی لەنێوان دەروونی دەرەکیدا. خەونەکان وباری دەرچوون لەبەدەن

خەونەکان پێویستیەك پێك دەهێنن بۆ هەموو خەڵکی کەوانەکردنەکان ڕوونی کردۆتەوە کە خەڵکی لەتوانایدا نیە بەبێ خەونەکان بۆماوەیەکی پتر لەچەند ڕۆژێ بمێنێتەوە، پێش ئەوەی کەلەلایان دەست پێ بکات بارە ئاڵۆزیەکانی ئاوەزی. کەکاروفەرمانی بنەڕەتی مەلاس دەدرێ بۆخەونەکان لەفرەکردنی کاتی درێژەدراودا (بێ پچڕانەوە) بۆنا هۆشمەندی و بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکەی بەرانبەر ئەوکێشانەی تایبەتە بەژیانت کە پەکت کەوتووە لەچارەکردنی دا لەباری بەئاگایی بوون دا ئە نجا بەبێ ئەو درێژەکاریە لەکاتدا بەفیڕۆدانی ئاوەزی تێژدەست بە پەرەسەندن دەکات. ئایا هەستت کردووە یان هەست دەکەیت بە پێویستی بوون بەخەوتن لەوکاتەدا کەتێپەڕ دەبیت بەکاتەکانی توڕەیی ودەمارگیریدا؟! بەراستی خەوتن بارێکی هەڵهاتن نی یە لەگرفت بەلام کات دەرەخسێنێ بۆ ناهۆشمەندیبەکارکردن لەسەر شیتەڵ کردنی گرفتەکە کەفرەبوونی خەونەکان دەروازەیەکە بۆ هۆشمەندی.بەراستی فرەبوونی باریك لەکارلەیەك کردنی گونجاو بۆ هۆشمەندی وناهۆشمەندی بە پێویست دەژمێردرێ بۆ پەرە پێدانی شارەزاییەکانی دەروونی ، کەلەسەریەتی ئەویش بەراستی لەفەرمانەکانی بنەڕەتی یەوەیە کەلەخەونەکان تێ بگەین ولەگەڵیدا ڕێك بکەوین لەسەرەتاوە لەسەرتە لە خەونەکانت بیربکەیتەوە...کەزۆربەمان بەتوانایین لەسەریاد هاتنەوەی خەونەکان بەڵام هەموومان نا.ئەگەر ئاستەنگیەکان بەرەو ڕووت بۆوە لەیادهاتنەوەی گرفتەکاندا بەسەر دەروونتدا دووکەرەت یان سێ کەرەت لە پێش خەوتن دا دڵنیای بکەرەوە کەدەبێ خەونەکانت یادبێتەوە کەئەوکردارەش چەند هەفتەیەك دەخایەنێ.بەڵام لەکۆتایدا تێبینی دەکەین کەتۆ بەئاگایت بۆ چەندکەرەتێ لەکاتی شەودا. واتە دوای هەر خەون بینینێك. دەتوانیت لەوکاتەدا پەراوو پێنوسێکت لابێت لەنزیك جێگەکەتەوە بۆ تۆمارکردنی خەونەکانت لەکاتی بەئاگاهاتنەوە لەخەوتن دا لەشەودا.کە لەبەیانیدا ئەوەی نوسیوتە بیخوێنەرەوە خواستی چوونەناوەوەت لەژێر کاری خەونەکەدا هەبێت.ئە نجالەوکاتەدا دەروونت ڕاهێناوە لەسەر یادهێنانەوە ونوسینەوەی خەونەکان،ئە نجا بەرپەرچدانەوەی دووەم دێت کەئەویش چۆنێتی لێکدانەوەیەتی. بەهەندێ لەخەونەکان دەگوترێ (خەونەکانی پالێوراو) کەلەماوەیدا، ناهۆشمەندی تێپەڕدەبێت بەهەموو ئەو ڕووداوانەی کەبەسەرتدا تێپەڕدەبێت لەو ڕۆژەدا، کەلەهەندێ کاتدا ڕاستینە دەبێ ولەهەندێکی تردا هێمایی دەبێت.ئە نجا خەونەکانی پالێوراو ئاسایانەیە و ئەویش ئەوەیە کەڕوو دەدات لەبەشی دەستپێك دەبێ لەخەوەکەت (کاتەکانی سەرەتایی بۆ خەوتنت) کەهەندێ لەخەونەکان پێشگۆیانە دەبێ، واتە ئەو خەونانە کەئەو شتانەی تیادادەبینی هێشتا بەدی نەهاتوون.زۆرجار نموونەی ئەم خەونانە ڕوونە کەبەئاسانی یادت دێتەوە، کەزۆرجار ڕووداوێك دەکەوێتەوە کەخەونت پێیەوە بینیوە لەماوەی نەوەد ڕۆژی ئایندەدا، کەلەهەندێ کاتی تردا هەست دەکەیت لەوکاتەدا شتێك دەگریت بەدەست یان دەستت بەرشتێك دەکەوێت وەکو ئەوەی کەبۆت ناسرابێ، کەهۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە کەخۆت پێشتر خەونت پێوە

بینیوه.کەدەشێ خەونەکان هاوشێوه بکەین لەلایەنی دەروونی یەوه، بەئەمباریك تا بۆ ڕاستی ژیان کاربکات لەسەر شیتەڵکردنی گرفتەکان کەوەڵامی دەدەیتەوه.لەوێ ژمارەیەك پرسیار هەیە دەتوانیت ئاراستەی بکەیت بۆ خۆت ( دەروونت ) کەیارمەتیت دەدات لەسەر تێگەیشتن لەخەونەکانت، لەوانەش:-

١ ) ئایا ئەم خەونە پەیوەندی بەژیانی راستینەمەوه هەیە؟.

٢ ) ئایا ئەم خەونە ئەزمونێکم دەداتێ تالەباری ئاگایدا لێی دووربکەومەوه؟.

٣ ) ئەگەر فەرمانەکە پەیوەست بێت بەژیانمەوه ماوەی دوورایی کاتی کەڵك وەرگرتن لەخەونەکەدا چەندە؟.

٤ ) ئایا ئەم خەونە پێچەوانەی ئارەزوو دەبێتەوه لەلام یان بەدیهاتنی ئاواتەکان؟

٥ ) ئایا ئەم خەونە چارەیەکی دروستم بۆ گرفتەکە پێشکەش دەکات؟.

٦ ) ئەگەرچارەیەك پێشکەش دەکات، ئەوا با کاری بۆبکەم لەکاتی بەئاگایدا بە پێی ئەوە یان بە پێچەوانەی ئەوەی کەبینیویەتی؟

ئەنجالەماوەی پێ هەستان ویادهاتنەوەدا خۆت دەبینیتەوه، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەتوانابوون لەسەر بەخشینی وەڵامە دروستەکان هەندێ لەخەونەکان کاری تێدەکرێ بەباری شانەزانیت یان بەدەن زانیت، بۆنموونە ئەگەر خەونت بینی بەجۆرێك لەخۆراکی وەکو مۆز کەڕەنگدانەوەی پێویستی بەدەنتە بەکانزای‌پۆتاسیۆم. هەروەها ئەگەر خۆت بینی لەئاش پەزخانەدا ( مەتبەخ ) کەبۆئەوەش مانای پەیوەندی بوونە بەرژێمی خۆراك لەخۆگرتنەوەوەت ( ڕجیم ) کەبەسەرخۆتدا سەپاندووە، هەروەها ئەگەر خۆت بینی کەفلچەی خودرۆکەت شکاندووە، مانای ئەوەیە کە بەگرفتەکانی بینین تۆش دەبی....تاد.

لێرەدا فەرمانێکی ترهەیە دەتوانیت بیکەیت کەئەویش هەواڵ دانی نەستە کەئەوەش پێش دابەستنی خەوتن لەشەودا بە بەوەی کۆتۆنامەکە بەدەست ناهێنیت، واتە کەخەونە ڕوون نی یە و لەسەریەتی کە خۆت جارێکی تر پێویستت بەڕوون کردنەوەی بێت لە ڕێگەی خەونەوه دەربارەی هەمان کێشە کەتێی ناگەیت لەخەونی یەکەمدا, کەلەتوانادایە نەست ئاراستە بکەیت بەرەو جۆرێك لەخەون کەدەتەوێت واتە وەکو ئەوەی ئەنجامی دەدەیت لەباری ئاگایدا.کەئەم کردارە ناوی ( بەرنامە کردنی نەستی ) پێ دەگوترێ. لەوێندەرێ هەندێ هەنگاوهەن لەوانەیە شوێنی بکەویت بۆ ئاسان کردنی کرداری بەرنامەکردن.کە پێش کاتژمێرێك لەچوون بۆ خەوتن، هەوڵبدە کەبەدەنت پشوو پێ بدەیت، وەکو ئەوەی چوویت گەرماویکت کردبێت، یان هەستابیت بەهەندێ ڕاهێنانی یۆگا یان هەستابیت بەهەرکارێکی تر کەلەدوایدا هەست بە پشوو بکەیت، واتە بەخاوبوونەوە لەبەدەن وماسولکەکانتدا.دوای ئەوە هەوڵ بدە هەموو ڕووداوەکان پیشان بدەیت ئەوە بەسەردا هاتووە وبەشێوە یەك لەدوای یەك بە پێی تواناکەت ئەمەش لەتوانای دایە کەیارمەتیت بکات لەسەرنجدان لەسەر پرسی خواستراو کەزنجیرەی ڕووداوەکان زۆر پێویستن..دوای ئەوە هەوڵ بدە بڕیاری شتێك بدەیت کەدەتەوێ نەستی بەرەو ڕووبکەیت...هەروەها لەوکاتەدا کەتۆخەوتیت ڕووناکی خامۆش بکە و لەسەرنجداندا درێژەبدە لەسەر

شتێك كەدەتەوێ خـەونی پێـوە ببینیـت. هـەروەها  ئەگەر بیرەكانی تری دەسـت تـێ وەردەر توشـت بـوون، هەوڵ بدە لێی رزگار بیت بەئارامی بۆ ئەوەی پارێزراو لەسەر ئاما نجەكەت بمێنیتەوە.بەراستی بەرنامەكردنی خەونەكان بەرهەمی لەئە نجامی جیاوازەوە، كەهەندێ جار باربووت دەكات لەشەوی یەكەمدا بەشیتەڵ كردن بۆ گرفتەكانت.هەروەها لەهەندێ جاردا ئەوە چەند رۆژێك دەخایـەنێ.كەلەهەنـدێ جـاردا دیـسان خەونەكـەت بەتەواوی بیردێتەوە ولەهەندێ جاری تردا تەنها چارەیت یاد دێتەوە.ئە نجدا یەكسەر توانا بوون لەسـەر یـاد هاتنەوە بەدەست دەهێنێ كە لەكاتی خەوتندا لەئاوەزتدا دەسوڕیتەوە.كەلەتواناتدا دەبێـت كـار لەسـەر یـاد هاتنەوە بكەیت كەبۆبەدەنت ڕوودەدات لەكاتی خۆیدا.ناوی ئـەوەش بنـێ ( هۆشمەنـدی لـەكاتی خەوتنـدا )، كاتێك دەربارەی ئەوەش كە یەكەم كەرەت خوێندمەوە بڕیارم دابوو كەئەزموون كردنەكەی لەخۆبگرم.كەلەیەكێ لەشەوەكاندا لەوكاتەدا كەچوومە سەرجێگاكەم كەلەسەر ئاراستەیەكی نە پچراوە دەربڕینـی ( مـن هۆشمەنـدم كاتێك بەدەنم لەباری خەوتن دابێت ) دەگوتـەوەو پارێزگـاریم لەسـەر درێـژەدانی بـوونی هۆشمەنـدیم كـرد هەرچەندە كەبەدەنم لەباری خەوتن دایە.

كە ئەم سەرنجدانە درێژكراوەیە بەكەلكم هات لەسەر مانەوەی ئاگایم بـەلاّم دوای ئـەوە خـۆم دابەدەسـتەوەو چوومە خەوتنەوە.بەلاّم لە پڕدا خۆم دۆزیەوە كەهۆشیارم لەبەدەنی سروشتی خەوتومدا، لەكاتی خۆیدا پـەیم برد كەئە نجامەكانم بەدەست هێناوە لەوبەرنامە كردنەمەدا. لەڕاستیدا دەستم كرد بەڕێكخستنی خەونـەكانم وتێبینیم كرد كەچۆن بەدەنم خاوبۆتەوە. پاشان بینیم چۆن ووزە هەڵدڕژێتە پێیەكا نمـەوە بـەوەی كەدەسـتی كردووە بەجوڵاندن.لەڕاستیدا خۆم كرداری بائاگاهاتنەوەم لەخەوتن بەتەواوەتی بینیوە.واتە چـۆن بـەدەنم گواستیەوە لەباری خەوتنی كوڵەوە بۆ گێرانەوەی ژیان بەبەرە بـەرەیی .هەسـتم كـرد بەناهەسـاوەیی كاتێـك بەدەنم جوڵانی وەرگرت وبەدەنم بۆ ڕا پـەڕین لەخـەو لەسـەر ڕێرەوێكـی خێراتـرە.بەراسـتی مـن بـەكورتی تێپەڕبووم بەئەزموونەكەدا لەكاتی خەوتندا كەهەستم كرد لەماوەیدا بەبوونی ئاگایم بەنزیكەیی كەئـەوەش پێش تەواو كردنی كرداری بەئاگایی هاتنەوەیە لەخەوتن.

كرداری بەئاگاهاتنـەوە لەخـەوتن بـەوەدا جیادەكرێتـەوە كەبەشـێوەی ئـارام ڕوودەدات كەلەوێنـدەرێ هـیچ جوڵەیەكی كوت و پڕ نیە. سەرەڕای ئەوە كەخۆم لە پێشدا ئەوە دەكەم هەرچەندە خۆم بەهۆشمەنـدی گەیـشتووم كەئەو بارەیە پتر لەبوونی دا بۆ بارودۆخەكان هەڵبژێردراوە.

هەندێ لەكەسەكان هەڵدەستن لەخەوتن، واتە لەباری نەستەوە دەگوێزنەوە بۆباری هەست بەشێوەی لـەناكاو، هەندێكی تر ڕادە پەڕن بەشێوەی بەرەبەرەیی واتە كەئەوان تێپەڕدەبن بەبارێك كەدەكەوێتە ناوەنـدی هـەردوو هەردوو گواستنەوەكەوە.لەوێندەرێ هەندێ زاراوەی بەكار هێنراوهەیە بۆ دەربڕین لەئەوبارانەی كەنێوەند دەبێ لەئاگایی وبەناخدا چوون دا لەخەوتندا بێت كەناوی وەنەوزەی - Hypnonomic بەسەردا دەبڕدرێ.

هەروەها ئەوەی نێوەندی خەوتن وئاگایی دەبێت جارێکی تر ناوی خەواڵوی hypnogogic بەسەردا دەبڕدرێ. هەروەها بە پێناسەی ئەوەی لە سەر پەرشتی کەرم لەسەر هەندێ لەفێرخوازەکان ئەوانەی ئەم دەرکەوتنەیان تاکی کردۆتەوە کەنەیان توانیوە تێی بگەن. چوونەتە ناو بەرەو ڕووبونەوەیەك لەگەڵ کەمینەیەك لەئەوانەی کەتێپەڕبوون بەبارێکی تایبەت لەهەڵوەشاندنەوە (گۆجی) لەکاتی گواستنەوەیان بۆ خەواڵوویی hypnogogic ئەوا ئاشکرادەبێت کەلەگەڵ پێشکەوتنیاندان بەرەو ئاگاییەکی تەواو لەوەی دەورەی پێ داون، خۆیان دۆزیوەتەوە کەبێ توانان لەسەر لێدوان یان جوڵانی وویستەنی. هەروەها کاتێك ترسیان لەگەڵدا دەبێ ماوەی هەست کردن درێژە دەکێشێ. بەڵام جوڵەی وویستەنی لەهەمووبارێکدا نوێ دەبێتەوە لەماوەیەکی کورتدا. کەبەدەن لەم بارەدا پترهێواش بووە لەگەیشتنیدا بەئاستێك لەووزەی خواستراو بۆکارکردن. واتە بە پێچەوانەی ئەوانەی توانایەکی گەورەتر بەدەست دەهێنن لەزاڵ بوون بەسەر بەدەندا. کە ڕێنوێنییەکانم بۆ ئەوکەسانەیە کەکەلکیان وەرگرتووە لەنواندنی ئەم ڕووداوانە، تا خاو دەبنەوە ودرێژەبدەن بەئەزموونەکە بەبێ ترس. هەروەها لەوبارانەی ناوەندین بۆهەست ، ئاگایی هەبێت وبەشێوەیەکی تەواو بێت بۆ ڕاساڵ بەڵام بەو گەواڵەیە نا کە زیرەکانە دەخزێتە نەستەوە. هەروەها لەسەریەتی کەزۆرتر کراوەبێت وپێشوازی کەربێت بۆئەوشتانەی لەبارەکانی ئاسایدان هەروەها هەلێکی جیادەرەخسێنێ بۆبەرنامەکردنی دەروونی ناوەوە. هەندێ لەوکەسانە هەڵدەستن بۆتۆمارکردنی بەرنامەکانیان لەسەر بەندێك (شرتیك) وکارپێ دەکەن لەوکاتەدا کەبەخەوتن تیادا نکوم دەبن، لەسەریەتی کەنامەکە کوڵ بێتەوە لەناهۆشمەندیدا کەلەسەر ڕێڕەوێکی خێراترە وەك لەوەی لەئاگایدایە. لەوێندەرێ ئاستێکی تر لەنەست هەیە پەیوەستە بەخەوتنەوە کەناشێ ناوی خەونەکانی بەسەردا ببڕین سەرەڕای لەیەك چوونی توانیان. کەدەشێ پێناسەی ئەم بەرزبوونەوەیە بکرێ بەوەی کەئەزموونی دەرچوونە لەبەدەن کەلەکاتی ئەزموونی دەرچوون لەبەدەندا، دەبێ بەدەن هەست پێ کراوبێت لەباری ناهۆشیاریدا. هەروەها کەزیرەکی بەباریك لەداماڵینی تەواو لەبەدەندا تێپەڕدەبێ. واتە لەدەرەوەی بەدەن دەبێ لێم گەڕێ پێناسەی ئەو ڕێگایەبکەم کەڕوو دەدات بۆ ژمارەیەك لەفێرخوازەکانم: لەخەوڕا پەڕیم لەشەودا کەخۆم دەبینیەوە هەڵواسراوم بەبنمیچی ژوورەکەمەوە ودەم وچاوم بەرەو ڕووی ئەردی بۆتەوە لەکاتێکدا بەدەنی مادیم لەسەر جێگەکە ڕاکشابوو. هۆشیاربووم بۆ وەستانم لەسەر زەوی بەڵام بەرەو ڕووی ئاستەنگی بوومەوە کەزاڵ بوون بەسەر جوڵەکانم دا. دەستی پێ کرد بۆم کەوەکو ئەوەی خۆم بەرز بووبمەوە ئەنجا دوای هاوارێك دەستم بەدابەزین کردەوە هەتاکەوتمەوە سەرزەوی لەوکاتەدا بەخێراییەکی گەورە پەیم بەخۆم بردو کە لەدەرەوەی بەدەنم دام.

ترس ولەرز دەستی پێ کرد هۆشم گەشایەوە بەوەی کەمردووم، ئەنجا هەستم کرد بەخۆم ووەکو ئەوەی بۆ بەدەنم دەگەڕێمەوە بەخێراییەکی زۆر. هەروەها لەکاتی چوونەوەدا بۆ بەدەنم بەخێراییەکی گەورە هەستم کرد بەهەستکردنێکی مادی (بەدەنی) کەهەواوە وئارام نابێ، دوای ئەوە بەخێرایی دنیشتم. ئەنجا دوای ئەوە ئەم

**ئەزموونــە نائاســاییە کەلەرزانــدمی وهەژانــدمی هەرچــەندە پــەیم بردبــەوەی کەنــەمردووم، کــەوا بووجارێکی تر خەوتن گەڕایەوە.بۆم کەئەم تاکیکردنەوەیە لەناکاو بوو کە پەست وبێزاردەبیـت لەبـەر ئـەوەی هەست بەلەدەستدانی زاڵیەتی دەکەیت. کەیەکسەر نمونەی ئەوە بۆت ڕوو دەدات ئەوەی کـەبۆت ئاشـکرادەبێ و لەوکاتەدا زیانت**

**پێ ناگات ئەوا ترست لەدەست دەدەیت.ئـە نجا ئـەزموونی داهـاتووت لەدەرچـوونتدا لەبـەدەن یادکردنەوەیـە و.یادت دێتەوە کەبەئاسانی گەڕاویتەوە بۆ بەدەن وجارێکی تر ئە نجا دەگەڕێتــەوە کەبەئەزموونەکـەدا تێپـەڕ بووم لەماوەیدا ناهۆشیار بووم بەبەجێ هێشتنی بەدەنم ترسم نەماو سەرنجم بۆ خۆش بوو لەسەر هەموو ئەوەی کەڕوو دەدات.**

**لەوکاتەدا هەستم کرد وبەشێوەیەکی کوتوپڕ کەخۆم بەشێکی جیاکراوەم ولەسەر بەرزایی شەش ئینجم لەئاستی لمی کەناری دەریای مارسافنیارد لەکەشیکی تاریکدا کەتوانام لەسەر بینین باش بوو سەرەرای تاریکایی...دەنکە لمەکان زۆر جوان بوون وگیایەکانم بینی بڵاو بوو بووەوە لەسەر کەنارەکە ئە نجا دەستم بەبینینی شتەکان کـرد کەخۆم ئەم بینی لەرێگەی گەردبینەوە هەموو دەنکێکی لم دەبینی بەجیالەیەکتری .کەلەوکاتەدا ڕوانیم گۆڕا بۆ دوورگەیەك کەتیابڵاو بوو بووە ماڵەکانی گەشت وگـوزاری بـچکۆلە، هەسـتم کردبـەبوونی کەسـانی خـەوتوو کەدیسان هەستم کرد بەئارامی زەریا و وەکو ئەوەی لەوپەڕی ئاگایدابم...هەروەها لەکاتی نزیك بوونەوەمـدا لە پە نجەرەیەکی ناو هەوای دەرچوو تێبینیم کرد بوونی دەرگایـەکی بـچکۆلە هەیـە کە پێـشتر نـەم بینیبـوو، هەرچەندە کەهەستی گشتیم پەیامی پێم دەدا بەوەی کەدەبێ کەهەبوبێت بۆ ئەوەی ڕێگە بدەیت بەتیپی ژەنینی مۆزیکا و چونەناوەوە بۆجێگەی پێشاندەران ودەرچوون لێ یەوە.کەلە چرکەیەکی کاتدابوو، هەستم کرد کـەخۆم دانیشتوم لەژووری دانیشتن لەماڵەوەم و چاوەکانم داخراون، کەبەشێوەی بەرەبەرەیی هەموو ئەوەی لەچواردەورم بوو ڕاست بوون... ئە نجا هەستم بەرۆژەڤی= تێکـەوتنی جیـاواز کـرد ئـەوەی لەسـەریەتی کاتێـك تێپـەڕیم بەئەزموونی دەرچوون لەبەدەنم کەجیابوبومەوە کاتێـك لەدورگەکـەدا بـووم. بەراسـتی ئـەزموونی دەرچـوون لەبەدەن زۆر باوەو بڵاوە وەك لەوەی وێنە بەرداری دەکرێ، لەبەر ئـەوەی زۆربـەی خـەڵکی بەئاسـانی یادیـان نایەتەوە کاتێك بۆیان ڕوودەدات، هـەروەها هەنـدێك وێنـە زۆرکـەس بـەرداری دەکـات وەکـو ئـەوەی خـەون دەبینێ.ئەزموونەکانی دەرچوون لەبەدەن ڕوودەدەن بەشـێوەی لـەناکاو کەدەگێڕدرێتــەوە لـەبارەکانی گـۆڕاوی لەهەستدا کەملی ڕێمان پێ دەگرێ جارێکی تر و سەرەرای ئەوەی لەتواناتدا دەبێ کەزۆر هۆشیار بیت بەنواندنی ئەم ئەزموونانە، هەرچەندە بەشێوەی ناو ویستی ڕوو دەدات واتە بەبێ ئاراسـتە کردنـی هۆشـیاری.کەدیـسان ئەگەری هەیە بارە گۆڕاوەکان بۆ هۆشیاری ڕووی پـێ بـدەن کەئـەویش ڕوودەدات کاتێـك بڕیارێـك وەردەگـرین لەمەبەستی گۆرانی هۆشیاری یان مۆڵەت دەدەین بەکەسێکی تر بەگۆڕینی بۆمان.**

## بێ خودی وخەواندنی موگناتیسی – Trance and Hypnosis

دەشێ ڕوو پێ دانی بارەکانی گۆڕاو بۆهۆشمەندی ڕیزبەندی بکرێ لەچوارچێوەی (بێ خودیدا) کەبێ خودی ئەوبارەیە دەبێ هۆشیاری هۆش تیادا نادیاربێت کە بوار دەدات بەناهۆشیاری (نەست) سەربەست بۆ ئاراستەکردنی مرۆڤ. بەراستی باری هۆشیاری هۆش ئاسایانە بەربەستیك پێك دەهێنێ لەبەردەم تێپەڕبوونی زانیاریە کەلەکە بووەکاندا لەناوچەکانی تردا لەنەستدا. ئە نجا لەباری بێخودی دا ئەم بەربەستە نامێنێ وڕێگە بەتێگەیشتنێکی کوڵتر وسەرتاسەری دەدات بۆ سۆزەکان وهەڵچونەکان.بەڕاستی زۆرترین ڕێگایەك کە باوبێت لەڕووی پێ دانی بێخودی دا خەواندنی موگناتیسیيە. کەخەواندنی موگناتیسی ئەو شێوازە هەنگاوەیە، هەنگاوێك کەڕێگەدەدات بەکەسی ژێرباری ئەزموونەکە خاوبوونەوەی تەواوی هەبێ بۆئاستێك کەلەگەڵیدا چالاکی هۆشیاری هۆش دەوەستێ,کەچالاکی هۆشیاری هۆش دەگوێزرێتەوە بۆباری (ناهۆشی)بۆیە لەتوانای مرۆڤدا دەبێت بگاتە ئەم بارە بێ خودی یە لەماوەی بیستنی دەنگێکی جوانەوە ڕستەیەکی دیاری کراو دووبارە دەکاتەوە کە پێی دەگاتە باری خاوبوونەوە کەدووردەکەوێتەوە لەهەر سەرگەرمیەکی هۆش دا.لەهەندێ لەبارەکاندا کەسی ژێرباری ئەزمونەکە (خەولێخراوی موگناتیسی) بۆ ئەوبارە چاودێری کردنەی بەدەنیکی جوڵاوە وەك خە پلەیەکی ڕوناك کەئەمەش لەتوانایدایە کەچاوەکانی ماندووبکات، یان هەرکەرەستەیەکی سەرنجدانی سروشتی تربێت.کەئەم کردارە هەڵدەستێ لەسەر بیرۆکەیەکی گوتراو کەماندوو بوونی بەدەنی پەلکێشی دەکات بۆ ماندوو بوونی هۆش. خەواندنی موگناتیسی ئاساییانە بەکار دەهێنرێ بۆ زانینی ئەمباری نەست یان دانانی بیرەکانی دیاری کراو تیایدا یان لابردنی بیرەکانی تر لێی و کەلەوێدا بیروباوەڕەدیاری کراوەکانی پەیام دەدات پێی کەتوشی نەخۆشی نەبێت یان ئازار نەبێت، کەئەویش باریکە سەرنجی لەسەر دەدرێ لەلایەن هەندێ توێژەرو پسپۆرەکانی دەرونیەوە وەکو بەجێ هێنانی کردارەکانی نەشتەرگەری بۆ ئەو نەخۆشیانەی دەناڵێنن لەئاڵۆش وخورەیەکی بەنج کردنی پێویست لەنەشتەرگەریەکاندا، یان پەیام دانەکانی کاری پێ لێ دەکرێ لەسەر ئەوکەسانەی کە خاوەنی خووە خراپەکانن داخوازی وەستانی ئەم خووە زیان بەخشانەی پێ دەکەن، وەکو پە نجەتەکاندن یان جگەرە کێشان و خوگری بەئەلکەهۆل ومادە سڕکەرەکان یان زۆر خۆری لەخواردندا ونەوسنی.کەبەبەکارهێنانی خەواندنی موگناتیسی خەولێخەرهەڵدەستێ بەباری ئاشکراکردنی نەست لەلای مرۆڤە خەولێخراوەکە- کەخەواندنی موگناتیسی بەکەرەستەیەکی چالاك دەژمێردرێ بۆ ئاشکراکردنی نەزانراوەکانی کەمرۆڤ تووشی بووە، کەوابوو باری هۆشیاری زۆرلەلایەنی بەربەست کردن یان بەرگرتنی ئەم هەستانە لەدەرکەوتندایە.کەمرۆڤ باری چارەسەرکردن بە خەواندنی موگناتیسی بەکارکەرێکی یاریدەر پەسەند دەکات لەسەرکەوتنی کردارەکەدا کەبەشیکردنەوەی دەروونی ناودەبرێ بەریگەی ئە نجامدانی خەواندنی موگناتیسی، کەدەبێ لێرەدا یادمان بێتەوە کەنەشیاوە خەواندنی موگناتیسیت بەبێ ئارەزووکردنت

وپەسەندكردنت بۆ بیرۆكەكە .بەڵام مەترسیی داردەمێنێتەوە كەڕێگە بدەین بەكەسی ناپێ هەڵستاو لەخەواندنی موگناتیسی دا لەبەر ئەوەی لەكۆڵایی هۆشیاریان دەدات.كەلێرەدایە دەبێ توێژینەوە لەكەسی پێ هەستاو لەخەواندنی موگناتیسی دا بكەین ئەگەر وویستمان ڕزگاربین لەهەندێ لەخووە خراپەكان.ئەنجا ڕاهێنان لەسەر خەواندنی موگناتیسی خۆیی یەكێكە لەكاروبارە ووروژێنەرەكان كەدەشێ فێری ببیت لەكەسی پسپۆڕ بەم هونەرەوە.بەتایبەت كە پەرتوكەكان بێجگەلەكەمێك شارەزایی نەبێت ئەوا فێری ناكات كەهەمیشە ناگەڕێتەوە بۆ سەركەوتن. بەسەرخەواندنی موگناتیسی خۆیدا ناوی خەواندنی موگناتیسی خودی بەسەردا دابراوە كەئەویش تەواو دەسە پێ لەسەر هەندێ لەجۆرەكانی ڕامان.كە پەرە پێدانی ڕامان مێشك دادەمركێنێ وئارامی دەكات. بەوەی دەتوانیت پەیببەیت بەمادەكە لەدەروونی ناوەوەتدا ئەویش بریتیە لەبێخودی ڕو پێدانی خۆیی دەبێت كە خەواندنی موگناتیسی خۆیی هەلێكت پێ دەبەخشێ بۆهەڵستان بەبەرنامە تایبەتەكەت، ئەنجا بیرەكان لەمێشكدا ، و مێشك دەروونی ناوەوەت دەچێنرێ.كەماوەی خاوبونەوەی كوڵ دەبێ كەبنكەكەی دیسان لەسەر بەدەن گشتگردەبێ، كەئەویش لەخەوتنی نیوەڕۆژەدەچێ.

## ڕامان وبیركردنەوە

لەوێدا چەندرێگەیەك هەیە بۆڕامان كەلەسەر توێژەرە باشترەكەی ئاشكرابكات لەماوەی ئەزموون و هەڵەكردنەوە، كەچاكترین ڕێگا ئاساییانە ئەوەیە كەكەسەكە دەگونجێ بەبێ یەكێكی تر.لەوێدا ژمارەیەك لەخەڵكی هەیە ئەوانەی بەخێرایی باوەڕدەهێنن تێك دەشكێن كەلەتوانایاندانی یە بچنە ناوبارێكەوە لەڕامان لەكاتێكدا كەڕاستی ئەوەیە كەئەوان ڕێگایەكی ڕاست یان لەبار نادۆزنەوە بۆیان. هەروەها پشت ئەستور بەڕێنوینیەكانی كە پێی گەشتووم لەخویندگەی بیری یەكەمدا، كەبۆماوەی چەندساڵێكە هەستاوم بە پێهەڵسانی ڕامان.هەستم بەگەوجی وكینە خواردنەوە كرد، كە پرسیارم لەخۆم كرد بۆچی سەرنەكەوتم وچۆن گەیشتم بەوئامانجە؟! ناتوانم لێبڕاوانە بەم، لەبەرئەوەی لەتوانای هیچ كەسدا نی یە بچێتە ناو ڕامانی كەسێكی ترەوە بۆ وێنەكێشانی بەراوورد لەگەڵێدا، بەڵام هەست كردنم بەكەوتن ڕاستیەكی ڕۆژەڤە پەلكێشیم دەكات بۆ وازهێنان لەهەمووشتێك. كەدوای ماوەیەك پەیم برد كەهیچم لانی یە پشتی پێ ببەستم لەنرخاندنی شێوازەكەمدا لەرامانلدا. وەستام لەهەوڵدانی فێربوونی سەرنج كە بەدوادا گەران دەستی پێ كرد لەتێگەیشتنی ڕوون ترەوە بۆمانای ڕامان.كەلە دەمی توێژینەوەمدا بوونی ژمارەیەك لەلێدوانەكان وپێناسەو تێڕوانینەكان دەربارەی بۆم ئاشكرابوو.كەبۆم بەبەر بەیەكدا چوو بوو لەگەڵ هەنێكی دا، كەلەدوایدا پەیم برد كەڕامان ئەو ناونیشانەیە بۆ بارێك لەبوون لەوكاتەدا كە چالاكی مێشك دەوەستێ. واتە كە مێشكی چالاك دەوەستێ لەكارەكەی بۆماوەیەكی كورت. ئەنجا كاتێ گەیشتین بەم پێناسە بڕوا پێكەرە، چوومە بەرەو ڕوو بوونەوەیەك لەگەڵ گرفتێكی گەورەتردا كەئەوش: چۆن لەتوانامدا دەبێ كەمێشكم لەكاربوەستێنم.چونكە مێشكم زۆر چالاك بوو كەكارەكەی بەخۆی پێك دەهێنا تائاستێك گران دەبێ لەسەرم زاڵ ببم بەسەریدا. كەمێشكم جەنجاڵ بوو

بــەبیرەکان و باوەڕەکــان ومــشت ومڕەکــان لەگــەڵ خۆمدا، بەوەی کەهەرهەوڵێك بۆخاوبوونــەوە لەلایــەن خۆمەوە هەل دەرەخسێنێ بە کەڵەکە بــوون و گەشــەکردنن بۆهــەموو ئــەم چــالاکیە ئاوەزیــە . ڕاهێنانــەکانی خاوبوونەوە بەکەڵکە بەڵام بەس نی یە. دوای ئەوە توش بووم بەڕامانی گــۆڕاو.کــەڕامانی گــۆڕاو یــان ڕامــانی سەرگەرم هەروەکو لەهەندێ کاتدا پێی دەگوترێ، ئەویش جۆرێکە لــەڕامان کــەباکوان شــری ڕاجــنش لەهینــد بەفێرخوازەکانی دەگوتەوە، ئەزموونی یەکەمم لەگەڵ ئەم شێوە دالەڕامان بوو لەڕێگەی یەکێ لەفێرۆخوازەکانی ڕاجنــشەوەیە، دوای ئــەوەی کەهەســتا بەبانگهێــشتکردنی هەنــدێ لەکەســەکان بۆهــاوەڵی کردنــی لەیــەکێ لەدانیشتنەکانی ڕامانی تێکەڵ و تپێکەڵدا کەبانگ هێشتنەکەی پەسەند کردلەگەڵ سێ کەسی تردا. لــەکاتی دانیشتنەکەدا هەستا بەشیکردنەوەی پەرەپێدانی ڕامان، پاشان مۆزیکایەکمان بیست دەنگــی ڕاجنــشی لەگــەڵ بووکەئەویش ڕامانی لادەبرد.ئە نجا کاتێك هێڵە پانەکانم بیست کاتێ هاتبوین لەسەرکردنی، دڵم تەنگ بــوو لەناخمدا بەتــایبەت سەبارەت بەوەی ژنێکی وەك من نیەیە گەیشتبێتە شەست ساڵ لەتەمەنی کــەڕکی لەبــەجێ هێشتنی بــان دانیشە دووبــاڵەکەی بێت، هەرچەندە کەلەخۆبای بــونم زاڵ دەبــوو بەســەر دوو دڵیمــدا هــەروەها خۆڕدانم زاڵ دەبووە بەسەر تەمەڵیمــدا. دان نــانم بــەتێك شــکاندنم دا ڕەت کــردەوە لەهونــەری فێربــوونی ڕاماندا..کەلەکاتی دەست پێکردنی دانیــشتنەکەدا چــاومان داخــست بــۆ چــوونەناوەوە لــەبوارێکی تــایبەتــدا کەچاودێرەکانی تێدا نەبێت، دوای ئەوە مۆسیکا دەستی پێ کرد. لەماوەی دەخولەکی یەکەم ئەوەندەی توانیمان هەناســەمان بــەکولی دا لەگــەڵ بــەردەوام بوو نمــان لەســەرنج دان دا لەســەر دەرکردنــی هــەوای پاشمــاوە لەسیەکاندا.کەئەمەش هەموو لەفەرمانیکی دابوو بەڵام نەك بەفەرمانێکی ئاســان، کەلەســەرم بــوو بۆچــەند کەرەتێ بووەستم بەڵام درێژەم دا بە پێی وویستنم .کەدوای تێپەڕبوونی دەخولەك درێــژەمان دا بەهەناســەدانی کوول، بەڵام بەدەنمان ڕزگارکرد بۆ جوڵاندن بەچــۆنیەتیەك کەدەدەتــەوێ.لەدەســت پێکردنــدا جــولام ولــەخۆم هۆشیار بووم بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا فەرمانەکە سروشــتی بــووەوە.کەبەشــی دوا یمــان لەدانیــشتنەکە بەسەربرد لەهەناسەدانی خێرا وجوڵــەی چــالاك دا، بــەڵام دەربڕینــی دەنگــی وپێکەنینــەکان وهاوشــێوەیان سەربارکرد ئە نجادوای ئەوەی کەدەدەنگمان بەزکردەوە بۆ دە خولەك لەسەرمان بوو لەسەر گیاکە ڕابکشێین بــەبێ ئەوەی هیچ شتێك بکەین ( هەستم کرد بەکامەرانیەکی بێ وێنە کەمن لەسەر ئەم بارەم بەڵام ســەلمێنرا کەئــەوە ڕامانێکی ڕاستینەیە....کەکاتێك ڕاکشام لەوێندەرێ دەستم کرد بەهەست کردن بەئــارامی وگشتگیری وفراوانیەك کەهەواکەی پڕدەکرد دەنگی خوڕەی ئاوم بیست لەگەڵ دەنگەکانی تردا کەلەئاسودەییەوە دەردەچون کەهــەمووی کەڵەکە بوو بوو لەم بێ دەنگیە گەورەیەدا کە پەیم پێ برد.هەستم بەئاشتی تەواوکرد، کەخۆم پێــشتر لەســەر ئەم پلەیە لەهۆشمەندی بەژیان وجیهان نەبووم ڕەنگە ئەم ڕامانە کــارتێکردنی لەســەر هــەبێ لەبــەر ئــەوەی ئاوەزێکی چالاك وبەدەنێکی ناچالاك بەدەست دەهێنم.هەروەها لەماوەی جوڵاندنی بەدەنمەوە بەتوانام لەسەر ئەوەی بچمەمێشکمەوە لەباری خاوبوونەوەدا. کەبەدڵنیایی پتر لەهەرجۆرێکی تر لەبارەکانی ڕامان کە پێیدا تێ

پەڕیوم خزمەتی کردووم، کەهەمان شت بەسەر تـۆدا پـەیڕەونابێت، بـەلام دەبـێ ئـەوەش ڕێگریـت نـەکات لە پێهەستانی ڕاماندا.

کەدەبێ لەوێدا شێوازێکی دیاری کراوبت گونجێنێ.ئەنجا دوابارەکانی گۆڕاو کەدەمەوێ دەمەتەکێی بکەم لێرەدا ئەویش بیرکردنەوەیە کەڕێگەیەکی بەکەلکە بۆ دەمەزەرکردنـەوەی توانـاکـەت لـەزال بوونتـدا لەسـەر هۆشـت وهۆشیاریت.

بابەتێك یان بیرۆکەیەك هەلبژێرە، ئەنجا بچۆرە ناوی لەباری ڕاماندا درێژەبدە. لەسەرنجدان لەسەری لێمان داوا بکەن ووشەی ( خۆبەخت کردن ) هەلبژێرین کەلەکاتێکدا تاکیمان کردۆتەوە. ووشەی ( خۆبەخت کـردن یـان کورەپانی دان ) وەربگرە وبچۆرەناوی لەباری ئارامی وخاوبونەوەدا، ئەنجا چەندبارەی بکەرەوە بـەدەنگی بـەرز بۆچەند کەرەتێ دوای ئەوە بیخەرە خوارەوە لەبیرتدا وڕێگە بدە بەهەموو بیرەکان وتێگەیـشتنەکانی کەهـەلت گرتووە بەگێرانەوەی بۆ پیشاندانی .کەلەدوایدا دەگەیت بەخالێك کەلەوێـدا هـیچ لـەبیرەکانی تـری لەگـەل نەبێت.چرکەیەك تێپەڕ بوو پێش ئەوەی کەهۆشمەندیم بەشێوەی کتوپڕ توش ببـێ بەوێنـەی پیاوێـك کـە پێ دەکەنێ هەرچەندە کەداکوتراوە بـەبزمار لەسـەر خاچـێك.ئـە نجا یەکـسەر چـاوم خـشاندەوە بەبیرەکەمـدا کەهەلەیە لە (کورەبانی دانەکەدا ) خۆبەخت کردنەکـەدا.ئـە نجا بـۆم ڕوون بـۆوە کەخۆبـەخت کـردن مانـای ڕزگاربوونە لەهەموو ئەوەی کەبەلام بۆدێنێ. ئەمەلەڕاستیدا بینینـی تـایبەتـە..گومـانی تێدانیـە کـەبینینم جیاوازە لەبینینت.کەبینین وپەند بارێك نین بشێ تێپەڕیان بێت بەلکو لەسەر کەسەکەیە کەتاکیان بکاتـەوە. ئەم کەرتەش بەهەندێ ڕاهێنانی تایبەت کۆتایی پێ دەهێنم بـەگۆڕانی بـاری هۆشـیاریت وکـوول کردنـەوەی شارەزاییەکەت لەگواستنەوەدا لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر، کەلەهەلبـژاردنی ئەندامەکانتـدا پـتر وورد بـە بـۆ پەیبردن وکردنی کەئەم فەرمانە وای لێ دەکات شیاوبێت.

## بەدەستەوە دانی هۆشیاریت بۆ بەدەنت

ئـەم ڕاهێنانـە چـالاکیەکی گـەورە بۆبـەدەن ڕێگـە پێ دەدات لەوکاتـەدا تـۆ هۆشـتی تیابارگـاوی دەکـەیت بەهەستیاریەکی بەرزەوە.

بەڕاستی بیرەکان وتێگەیشتنەکان وهەستەکان ئەو ووزانەن بەتەواوی کە لەبەر دەخەنە بەدەنی سروشتیت.لەم ڕاهێنانـەدا هەلدەسـتیت بەئاراسـتەکردنی بیرەکـان وتێگەیـشتنەکان وهەسـت کردنـە دیـاری کراوەکـان بەئاراستەکانی تایبەتـدا بەناوبەدەنـدا...بـا لەکەللـەی سـەرەوە دەسـت پـێ بکـەین. هۆشـیاربە بـەخالی سەرنجدانی هۆشـیاری لەسـەرتدا، خـەیال بکـەوە کەئـەم خالـە سـەرنجدانە ئێـستا دەجـولی لەسـەرتەوە تابگوێزێتەوە بەناوبەدەندا بۆ ئەوەی پەیوەندی بکـەین بەهـەموو بەشـێك لێیـەوە کـەبۆ بەشـداری کردنـی هۆشیاریتە لەگەلیدا.وێنەبەرداری بکە کەتۆ خۆت ببینیتەوە لەسـەرتدا، بـەلام دەجولێـت بـەناو بەدەنتـدا، ئەنجا بۆماوەیەکی کورت دەوەستیت لەجێگایەکدا، یان لەجێگایەکی تردا لە پاشاندا لەگەلی یەکدەگریتەوە،

دا نمان بەکەسەکان ئەوانەی کەلەشوێنێکی تر ژیاون یان لەژوورێکی تردا ژیاون...کەوابوو دیوارەکانی ژوورەکە وکەل وپەلەکانی ناوی شەپۆل ولەرینەوەکانی بیرەکانی کەسانی هەبوو لەژوورەکەدا هەڵدەمژن. کەکارلێکردنێکی سۆزداری توند لەژوورەکەدا بەجێ دەهێڵێ کاتیك کەسانیکی تێدابووە هەتاوەکو ئەو کەسانەش کەبۆ هەمیشە ژوورەکەیان جێ هێشتبێت. نمونەش لەسەر ئەوە، ئەگەر دووکەس پێکەوە کەوتنە مشت ومڕێکی توندەوە لەژوورێکدا وپاشان ژوورەکەیان بەجێ هێشت کاتیك لەدوای مشت ومڕە کە چوویتە ئەو ژوورەوە هەست دەکەیت بەباریك لەتوندی وگرژی و توڕەیی.بێ ئەوەی کەهۆکەی بزانیت. ئەوەش لەبەر ئەوەیە لەرینەوەکان بۆماوەیەکی درێژلەکات دەمێننەوە. تامانەوەی بۆماوەیەکی درێژتر لەشوێنێکدابن، لەرینەوەکان بەهێزتردەبن کەبەوەش دامەوەی مانەوەی لەرینەوەکان درێژتردەبێت.شوێنە مێژووییەکان یادگاریەکان لەسەدەکان وشوێنەکانی تردا دەوروژێنێ، کەلەهەندێ کاتدا، کاتێك دەچیتە ژووریکەوە یان شوێنێکەوە، وەکو ئەوەی تۆ بەو شوێنە ماڵی بیت واتە وەکو ئەوەی کەتۆ لەوەو پێش بینیبێتت. لێرەدا هەستێکت لەگەڵ دەبێت و بۆ دروست دەبێت پێی دەوترێ- deja vu -کەدەربڕینێکی فەرەنسی یەو مانای (بینینی پێشتر) دەگەیەنێ...کەئەمەش هەستێکی تایبەتە ئێمە کە پێشتر شوێنێکەمان بینیوە یان پێیدا تێپەڕیوین، زۆرجار دروست دەبێت کاتێك دەکشێینەوە یان بەیادگاریەکانی ژیانی پێشومان هەڵدەدەین کە لەو شوێنەدا دەردەکەوێ یان کە ئێمە خەونێك یاد دەهێنینەوە یان ئەزموونی دەرچون لەبەدەن کە پێی هەستاوین لەماوەیدا بەسەردانی ئەو شوێنە.ئەنجا کەوەڵام دەدەینەوە لەهەندێ کاتی تردا بۆ مێژووی جێگەیەك بێ ئەوەی کەلەوێ هیچ پەیوەندیەکی کەسی هەبێت، بەڵکو کەدیسان پێمان دەگات ئەوەی لەوێ ڕوو دەدات...هەروەها توانین لەسەر پەیبردت پەیوەست دەبێ بەشێوەیەکی گەورەتر لەگەڵ (تۆچۆنیت) کەنەك لەگەڵ ( لەکوێ دەبینرێ ).و کرانەوە لەسەر توانین یارمەتی دەدا لەسەر پەیبردن، لەکاتێکدا داخران ڕێگرەی لێ دەکات .ئێستا بەسەر زانیندا کەوتویت بەچۆنیەتی پەیبردن دا کە چی پەی دەبەیت دا.... هەروەها ئیستا کاتی ئەوە هاتووە ڕاهێنانەکان لە پەرەپێدانی شارەزاییەکەتدا بەجێ بهێنی لە پەیبردنەکاندا. گرنگ ئەوەیە شارەزاییەکانی پەیبردن پەرە پێ بدەیت لە پێش شارەزاییەکانی دەرخستنەکانت دا.... کە پەیبردن ڕەگەزێکی هەڵمژینە بەدەست دەهێنرێ لەماوەی زانیاریەوە. کەزانیاری سەرداری دەکات بۆ پەندو زانین .بەڵام شارەزاییەکانی دەرخراو ڕەگەزێکی ئاراستە کراوە لەڕێگەیەوە کار لەسەر شتەکان وکەسەکان دەکرێت کەلەدەورو بەرت دان...کەبەکار هێنانی بەبێ زانین و ئەزموونیش بەگرفتی گەورەوە سەرتدا دەکشێت کە پێویستە هەڵ نەستیت بە شارەزاییەکانی دەرخراو بێجگە لەوکاتەی پلەیەکی بەرز لەهۆشیاربوون بەخۆت بەدەست دەهێنیت، کەلەبارێکدا دەبیت و ئامادەت دەکات بۆ گرتنە دەستی بەرپرسیاری بەرانبەر کەسانی تر. پێویستە لەهۆشتدا بزرو ئاوا نەبێت کە هەندێ لەڕیزبەندیەکانی کەکارت پێی کردووە بۆ شارەزاییەکانی دەروونیش پەیبردن و دەرخستن لەکاتێکدا بۆ شارەزاییەکانی دەروونی کوێرانە دەبێت ولەسەر ڕوویەك کە دوورخستنەوەی دەبوێرێ کەڕەنگە تۆ لەسەر پەرەپێدانی شارەزاییەکەی پەیبردن

ودەرخستن لەهەمان کاتدا کاربکەیت.کەزۆرتریش لە ئــەوە دەبــێ کــاتێکی لەبۆتــە دراوی لەگــەڵ بەسەربەریت ....واتە کەڕاهێنانەکان بەکارکەری لەبۆتەدراو بەراود بکەیت وەکو ئەوەی کەمن دەیکەم.

## کەرتی شەشەم

## ڕاهێنانی شارەزاییەکانی پەیبردن

لەکەرتی پێشوودا ئەو ڕێگایانەی کە پێیەوە پەی پێ دەبەین لەگەڵ چی پەی پێ دەبەین پێناسـەکرا. کەواتـە ئێـستا تـۆ ئامادەیـت بـۆ دەسـت پێکردنـی شـارەزاییەکانت لە پـەیبردن دا. لەکـەرتی یەکەمـدا هەسـتام، بەدابەشکردنی شارەزاییەکانی دەروونی لەچوارچێوەی دوو ڕیزبەندی گەورەدا کەئەویش شارەزاییەکانی پەیبردن و شارەزاییەکانی دەرخستنە یان بەمانایەکی وەرگرتن وناردنە. کەلەم بەشەدا ملـی ڕێ دەگـرین بـۆ چـۆنیەتی پەرەپێدانی شارەزاییەکانی دەروونی وڕاهێنانی لە پەیبردندا یان وەرگرتندا.

شارەزاییەکانی پەیبردن ئەو شـارەزاییانەن کەیارمـەتیمان دەدەن لەسـەر وەرگرتنـی شـێوە پێـوە گرتنـەکان وپەیوەندیەکانی بەستراوە بەکەسانی ترەوە جا کەسەکان بن یان شوێنەکان بن یان شتەکان بن. پەیبردنـەکان لەسەر ئاستێك دەردەکەوێ جیاوازبێت لەئەوەی پەیوەستە بەزیرەکی یەوە.بۆیە هـەنگاوی یەکـەم بـۆ ئەوەیـە وەرگریکی باش بێت ئـەویش بەچـۆنیەتی هێورکردنـەوەی ئـاوەزی هۆشمەندیتـە.لەکـەرتی دووەمـدا ڕێگـای هێورکردنەوەی ئاوەزی هۆشمەندیمان گفت وگۆ لێ کرد.ئەنجا ئەگەر هەستت کـرد بـەخۆت نـەت زانیـوە ئـەوا جارێکی ترپیـشانی دەدەمـەوە پـێش دەسـت پێکردنـی ڕاهێنانـەکان کەئـەم کەرتـە لـەدەرگای دەدرێتـەوە. کەڕاهێنانەکانی لەیەکتری دەچن کەئەم لەگەڵ ئەم کەرتی شەشەم دا.

ڕاهێنانەکان لەم کەرتەدا لەیاریەکان دەچن بەمانای ئەوەی کەدەبێ لەبۆتەی بدەی سـەبارەت بـەخۆت.کـاتی درێژ بەسەر مەبە لەگەڵ هەر ڕاهێنانکدا.کەباشتر وایە جم وجۆڵ بەخێرایی بێت لەڕاهێنانیکەوە بۆ ئەوی تر، کە لەجیاتی دووبارەبونەوەی ڕاهێنانەکەیە کەرەت لەدوای کەرەت ئاراستەی لە بۆتە دراوی خالی لەگرنگی پـێ دان بۆ سەر کەوتنێکی گەورەیە، بۆیە خۆت ناچارمەکە وزۆر لەخۆت مەکە لەسەر بـەجێ هێنـانی ڕاهێنانەکـە، بەڵکو بەرو ڕووی ببەرەوە بەگورج وگۆڵی یەوە کە بانگمان دەکات ( ببینین چی دەکەین ) لەجیاتی ئەوەی بیکەینە پرسیك ( کەیان ئەنجامی بدەیت یان کە بمریت ) لەبەر ئـەوەی بـەوەدا شـارەزاییەکانی دەروونیمـان لەکۆسـپ وتەگەرەیکدا بەکار دەهێنین کە ناردن و وەرگرتن کەڵەکە دەکات.

بەهیچ ڕاهێنانێك هەڵمەستە کاتیك ماندووبیت یان سست بیت.چونکە هەست کردن بـەبێ ئومێـدی هەسـتیاری دەروونیمان دەکوژێت. بۆیە لەسەرتە لێی دوور بکەویتەوە. کە توێژەرەوەکان ئاشکرایان کرد کاتێـك کەسـەکان هەست بەبێ ئومێدی دەکەن لە پێ هەڵـستانی ڕاهێنانــەکانی تایبــەت بە پەیبردنـەکانی هەسـتی باڵا، ئـەوا هەڵدەستن بەدەربڕین لەو هەستە ناهەز لێ کـراوە کـە بەبـەکارهێنانی هێزەکـانی دەروونیـان بەوەڵامدانـەوە

هەڵەکان دەگەن کەلە نموونـەی ئـەم بارانـە ئـەو کەسانەن لەسەر ( توشـبوونە خرا پـەکان ) واتـە بـەبێ ئاستێك کە بە دی دەهێنن لەهەڵسەنگاندنی گوێرانەدا کەلەچوار چێوەی دا ناچێتە تواناکانی دەروونیەوە.

### -وەرگرتنی هاوبیری-

وەرگرتنی هاوبیری ئەو شتەیەکە گەشەدەکات بەشێوەی سروشتی لەنێوان کەسەکاندا ئەوانـەی پەیوەندیـەکی سۆزداری بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە.....واتە بزانی کەبەچی بیردەکاتەوەیان کەسەکە بەچی هەست دەکات بەبێ ئەوەی ئەو کەسە بەزارپێت بڵێت...... کەبە پێهەڵستانی دەتوانی تواناکەت پەرە پێ بدەیت لەسەر وەرگرتنی هاوبیری لەهەر کەسێکەوە بێت و هەرچۆنێ بێت.

### ڕاهێنانی ژمارە -١- لەوەرگرتنی هاوبیریدا ( دووکەس )

بانگی یەکێ لەهاوڕێکانت بکە کەلەهۆشیدا جۆرێك لەمیوە هەڵبژێرێت ئەوەی کەهـەزی لێ یـەتی.دوای ئـەوەی بانگی هاوڕێکەیت بکە کەوێنـەی پارچـە مێـوە هەڵبژێردراوەکـەی هۆشـی بـۆت بنێریـت...هـەروەها لەسـەر هاوڕێیەکەتە کەجارێکی تر لەهۆشیدا ، ناوی میوەیـەکی هەڵبـژێردراو چـەند کـەڕەتێك، دووبـارەی بکاتـەوە کەلەوکاتەدا هەڵدەستی بەوێنە بەرداری کردنی، واتە لەسەریەتی کەمیوەکە ئاوەزیانە بـۆت پێناسـە بکـات. نمونەش لەسەر ئەوە، دوای چەندبارەکردنەوەی ووشەی ( خۆخ ) چەندکەرەتێك لەهۆشت بێوە، ئە نجا هاوریکەت هەڵدەستی بەوێنەکردنی شێوە خڕپەکەی وڕەنگـە ئەرخەوانیەکـەی وتوێکڵـە نەرمەکەی،کـە ئاوەزیانـە بـۆت نێردراوە. پاشان شێوە پێوەگرتنەکان بنوسەوە، دوای ئەوە بگوێزەرەوە بۆ جـۆرێکی ترلـە لـەمیوە. دەبـێ هـیچ هەوڵێك یان ڕاهێنانیك زۆرتر لەسی( ٣٠ ) چرکە نەخایـەنێت، دوای ئـەوە هەسـتە بەراسـتکردنەوەی بەرپـەچ دانەوەکانت. یـادت بهێنـەوە کەئەگـەر شکـست هێنـاو سـەرنەکەوتی وسـەر نەکەویت،ئـەوا هەڵەکـە دەشـێ لەناردنداببێت.واتە وەکو ئەوەی کەڕوودەدات لەلای وەرگر، کەدیسان کارەکە دەگەڕیتەوە بۆکەمی شارەزایی لـەم بوارەدا. ئەم ڕاهێنانە چەندبارەبکەرەوە بۆپۆلەکانی تری وەکو سەوزەکان وگوڵەکان. وێنەبەرداریەکەت بـانگ هێشت بکە بۆ ئەوشتانەی سادەو بەردەستن. ڕەنگ پۆلێنێکی باش ئامادە دەکات . لەبەر ئەوەی بەتاڵـە لەهـەر وێژەکاریەك کەتوشی دەبێت.هەروەها ئەگەر سەرکەوتنت بەدەسـت نـەهێنا سـەرەرای ژمـارەی هەواڵـەکان بـۆ کۆمەڵێك لە پۆلین کردنەکان"، لەسەرتە نێرە بگۆرێت.

### ڕاهێنانی ژمارە -٢- لەوەرگرتنی تاکدا

کاتێك زەنگی تەلەفون لێدەدات، بیخە مڵێنەکە دەبێ لێدوانکەر کـێ بێـت؟ کەئـەوەش لـە پـێش هـەلگرتنی تەلەفونەکەدا دەبێ.لەهەندێ کاتدا دەزانی لێدوان کەر کێیە چونکە چاوەڕوانی دەکەیت کەلێرەدا لەتوانادا نی یە ئەو پەیوەندیانە لەچوارچێوەی بەرکەوتنە ڕاستەکاندا بێنەناوەوە.ئـە نجا بـە پێ هەڵـستان دەیدۆزیتـەوە

چــونکه تــۆ باشــبوونێکی بەرچــاو بەخۆتــەوە دەبینیــت...هــەروەها ڕاهێنانەکــەی تــر کە پەیوەنــدی کردنە بەکەسێکی ترەوە لەچرکەیەکدا کەناوهێنانی لەئاوەزتدایە و پرسیاری لێ دەکەیت کەئەمە کەسەیە بیری لەتۆ کردۆتەوە. ئە نجا سەرسام دەبێ کاتێ فێردەبێت کە پەیوەندی کردنی هــاوبیری زۆرتــر بــلاوە لەجوڵانــدن وهاژوونی خودی بیرەکەدا.

## ڕاهێنانی ژمارە -٣- لەوەرگرتنی هاوبیری کۆمەڵدا

چەند کەسێك لەژووریکدا کۆبکەرەوە ژمارەیان هەشت تاوەکو دەکەس بێت. داوایان لێ بکە ڕێــك بکــەون لەســەر شتێك بۆ سەنج دان لەسەری لەکاتێکدا تۆ ئەو ژوورەی تێیدایت بەجێ‌ی دەهێڵیت.ئە نجا لەکاتی ئامادەبونیــان بۆ ژوورەکە ئامادەببەو هەوڵی خەملاندن ونرخاندنی ئــەو شــتەبکە کەهــەڵیان بــژاردووە. زۆربــەی کەســەکان لەسەرەتادا سەرکەوتێنکی کەم بەدەست دەهێنن. بەلام نیگەران مەبە سەبارەت بەوە کەهەرچەندێ ئاسوودەبیت ئەما ئەگەری سەرکەوتنت پتردەبێت، هەوڵ بدە هۆشت لە بیرە تایبەتیەکانت پاك بکەیتەوە ئە نجا لە پاشاندا هەوڵی سەرنجدان دەدەیت لەسەر ئەوانەی کەسانی تر دەینێرن.کەتروسکاییەك لەڕەنگ یان شێوەیەك بەدەست دەهێنــی.تەماشــابکە ئەگــەر لــەتواناداںوو وێنــەی هۆشــت لەگــەڵ شــتێك کــەوەرت گرتــووە لەژوورەکــەدا ببەستیتەوە...دوای ئەوە دەست نیشانی بکە بەخەملاندنەکەت. کــە لەســەر هــەر تاکیکــە لەکۆمەڵەکــەدا تــا بەڕاهێنــان هەڵبستێ کەئەوەش بەبەجێ هێشتنی ژووەکە دەبێت کەلە پاشاندا گەراوەنەوەیە بۆی بۆ وەرگرتنــی ئەوەی کەسەکانی تر دەینێرن لەژوورەکەوە.

## ڕاهێنانی -٤- لەوەرگرتنی هاوبیری دووکەسدا

داوا لەیەکێ لەهاوریکانت بکە. کەژمارەیەك لەوێنەی شتێکت بۆ کۆبکاتەوە یان دیمەنی ڕوون ودیارەکان بێــت. کەلەگۆڤار و ڕۆژمێرو کارتی سەرچاوەی باش بێت بۆ هەڵبژاردنەکە دوای ئــەوە داخــوازی لەهاوکارەکــەت بکــە کەیەکیك لەوانە هەڵبژێرێ بەبێ ئەوەی بۆی بڕوانێ ئە نجا لەژووریکدا دابنیشە وهاوریکــەت بــانگ بکــە تــا لەژوورەکەی تردا دانیشێ کەئەو بــۆ وێنەیــەك بڕوانــێ کەواتــە ئــەو هەڵدەســتێ بــەناردنی وێنەکــە بــۆت بەهاوبیری.هەوڵ بدە هەرشێوە پێوەگرتنیك کەوەری دەگریت بینوسیتەوە هەرچەند ئاسان بێت یــان ڕووکەشــی بێت یان ناتەواوبێت.

دوای خولەکیك داوا لەهاوڕیکەت بکە وێنەیەکی بنێرێت... دوای تەواوبوون هەســتە بەبــەراوردکردنی وێنەکــە لەگــەڵ دروســتی وەلام دانەوەکــەت ...کەبــە پێ هەڵســتان خــۆت دەبینیتــەوە لەســەر زۆرتــر لــەو وردەکاریەکان.بەراوردی بکە ئەوەی نوسیوتەتەوە لەگەڵ وێنەی ئامانج داردا دەبینیت چــەند لــەو شــێوە پێــوە گرتنانە ڕووکەش وناتەواون و پەیوەندی هەیە بەوێنەکەوە.بەلام ئەگەر شکستت هێنا بە بەر دەوامی لەگەیشتن دا بەشێوە پێوە گرتنەکان هەتاوەکو دوای چەند ژمارەیەك لەهەوڵەکان ئەوا هەوڵ بدە کەسیکی تر هەڵبــژێری بۆکاری ناردن.

**ڕاهێنانی ژماره -٥- لەوەرگرتنی هاوبیری کۆمەڵدا**

کەرەستەی ئەم ڕاهێنانە جیاوازە لەڕاهێنانی پێشوو...کەوابوو بەلای کەمەوە دووکەس دەخوازێ...کەبتوانن بەجێی بهێنن لەچوارچێوەی کۆمەڵەکەدا.ئەم ڕاهێنانە وێنەیەکە بۆ چۆنیەتی بەجێ هێنانی کۆمەڵەیەك بۆیەك ڕاهێنان و هەرکەسە پێنوس و کاخەزێك وەربگرێ دەشێ بەکارهێنانی گۆڤارەکانە بۆ دەستەوە بگری و لەسەری بنوسیت....بانگی یەکێ لەهاوریکانت بکە بچێت بۆژوورەکەی تر بۆ کاری ( نێرەر ) کەئەوانی تریش کاری ( وەرگر ) ئەنجام بدەن نێرەری وێنە بڕیاردەدات کەسوربێ لەوێنەکێشانی پاشان وێنەکە ڕاست دەکاتەوە لەگەڵ وەرگرتنی بیرۆکەی وێنەکە بەڕوونی لەهۆشیدا کەلەسەر نێرەرە دیسان کە سەرنج لەسەر وێنەیەك بدات تاوەکو سەرۆکی کۆمەڵەکە بانگی دەکات بۆ تاکی کردنەوەی بەوەی کەکەسانی تر وێنەکانیان کۆتایی پێ هێناوە کەباوەریان وایە ئەوەیەکە پەخش کراوە. هەروەها کاتێ نێرەردەگەڕێتەوە ژوورەکە کەوەرگرەکانی تیادا دەبینرێ دوای وێنەکێشانی شێوە پێوە گرتنەکانیان، بەراوردکردنی وێنەکان هەمووی دەست پێ دەکات خواستی گەیشتنە بۆی بەووردی، کەوابوو ئەنجامەکانی گفت وگۆی تەواو لێ کراوە .هەروەها لەئەستۆی ئەم ڕاهێنانەدایە کەهەر کۆمەڵ بوونێك بە پێی بوونی تەرخان کراوە پتەو بکات. هەوڵ بدە پێناسەی ئەم ڕاهێنانە بکە لەگەڵ هاوریکانتدا بەتایبەت لەوکاتانەدا کەتیایدا هەست بەبێ ئومێدی دەکەن.ئوپتن سینکلیر لەنوسینی ( ئیستگەی ئاوەزی )دا لەچەند کەرەتێك دا کەتیایدا ژنەکەی بەتوانابووە لەسەر لەبەرگرتنەوەی وێنەیەکی وورد لەوەی بەخۆی وێنەی دەکێشێ لەژووریکی تردا.

کەدەبینێ پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ هاورکەیدا یان نزیکەکەی دا کارتێکردنی لەسەر تواناکەی هەیە لەوەرگرتنی نێردراوەکان لێ یانەوە.سالآنێکی زۆر لەتوێژنەوە لەهاوبیری هۆشی دا ئاماژە دەکات، کە پەیوەندی سۆزداری دەشێ کەکارکەریکی گرنگ بێت لە پەخش کردنی ووردا بۆ بیرەکانی هاوبیری کەزۆرجار تۆماری بارەکانی هاوبیری لەناکاو کراوە لەنێوان دووکەس دا کە پەیوەندی پتەو بەیەکیان دەبەستێتەوە کەلەسەر ڕوویەکە پتر لو بارانەدا ڕوودەدات کە لەنێوان کەسانی تردایە کەخواستی هان دانت لە پەرە پێدانی شارەزاییەکانی دەروونیت دایە، کەباشترین کار لەگەڵ کەسی سۆزداردا لەگەڵتدا بە پەیوەندیەکی پتەو پێتەوە دەبەستریتەوە.

**ڕاهێنانی ژمارە -٦- لەوەرگرتنی هاوبیری بەکۆمەڵدا**

لێرەدا لێك چوونێك هەیە لەنێوان ئەم ڕاهێنانە وڕاهێنانی ژمارە سێدا-٣- بێجگە لەوەی کەلەجیاتی سەرنجدان لەسەر بەشێك لەبەدەنی کەسێك، بۆ نمونە وەکو لوت وگوێچکە وپێ دوای ئەوە کەسی تاکیکراوە هەڵدەستێ بەبڕیاردانی بەشێك کە لەلایەن کۆمەڵێکەوە تەواو هەڵبژێردراوە بۆ سە نجدان لەسەری.

نموونەش لەسەر ئەوە تۆ هەڵدەستیت وەکو وەرگرێك بە پاکژکردنەوەی هۆشت بۆ گواستنەوە بەکەلێن پێ بردنی ئاوەز بۆ باری بێ ئاوەزی.کەهەست دەکەیت بەچێژێکی نەرم لەگوێچکەتدا یان لووت و پێکانتدا. تەماشابکە

کەئەو یەشـەش ئەوەیـە کەکۆمەڵەکـەت سـەرنجی لەسەریەتی.دیسان دەردەکەوێ لەسەر شـێوەی ( لێـدان ) یان بوژانەوە لەیەکێ لەشوێنەکانی بـەدەنت کەئـەویش بەگێرانـەوەی ئاماژەکـەرە، یـان کـەتۆ گوێـدەگریت لەهۆشـتت دا لەووشـەی گـوێ یـان لـووت یـان پـێ یـان هەربەشـێکی تـری بـەدەن کەئـەوان سـەرنجیان لەسەرە....هەروەها بە پێ هەڵستان پێی بـەتوانا دەبیـت لەسـەر وەرگرتنـی نامـەکان ڕاسـتەو خـۆ لەسـەر بەدەنت . نمونەش لەسەر ئەوە، ڕەنگە هەمیشە ووشەی هۆش ببیستیت یان هەست بە بوژانەوە بکەیت لەبەشێکی بەدەنتدا کە ئەو شوێنەش جیگەی سەرنجی کەسانی ترە.

## هەست کردن بەشتەکان وکەسەکان

بۆ هەرکەسیك کێڵگەیەکی ووزە هەیە پێی جیادەکرێتەوە وەکو ئەو بارەی لەگەڵ هێڵەکانی پە نجەکاندا هەیـە کەدەشێ لەلایەن کەسانی ترەوە هەست بەو کایە ڕووناکی یە بکرێ.

هەروەها لەگەڵ عەست کردنی نزیکماندا دەتـوانین بڕیـاری جێگـەی کەسـێك بـدەین لەخۆمانـدا، کەبـە پێ هەڵستان دەتوانین کەبڕیار لەوکەسە بدەین.هەست کردن بەشتەکان زۆر تر گـران دەژمێـردرێ لەهەسـت کـردن بەکەسەکان لەبەر ئەوەی تێکرایی لەرینەوەکان لەشتەکاندا زۆر تر هێواشە لەکاتێکدا کایەی ڕووناکی تێیـدا بچوکترە زۆرتر لەوەی کەهەیە لەلای مرۆڤ.

ڕاهێنانی ژمارە-١- لەهەست پێ کردنی کەسەکاندا ( دووکەس )

بـانگی هاوریکەت بکە پێڵاوەکەی دابنێ ودەست بکـات بەڕۆیـشتن لـەدەوری ژوورەکـەدا لەکاتێکـدا چـاوەکانت بەسترابێت بە پەرۆیەك یان بەستەریك بەلام لێدوان دەکەیت. ئە نجا کاتێك دەڵێیت بووەستە لەسەر هاوریکەتە کەڕۆیشتنی بووەستێنێ و خۆی بەهێوربگرێ ولەسەر ڕوویەکی نەبیسرتـاو بۆ ئەوەی نەتوانیت شوێنەکەی دیـاری بکەیت لەڕێگەی بەکار هێنانی هەستی ئاساییەوە.,هەوڵ بدە ووزەکەت ئاراستە بکەیت بەچـوار لای ژوورەکـەدا واتە وەکو ئەوەی ڕاداریك کاربکات...ئایا هەست دەکەیت بەلەرینەوەکانی هاوکارەکەت. ئەوەش لەسەر ڕوویەکی خێراتـر و ڕوونتر تەواو دەبێت لەهەوڵدانی خەملاندنی هەرشتێك لەژوورەکەدا.ئـەو شـوێنەی کەهاوکارەکـەتی تیادا دەبینرێ هەڵی سەنگێنە لەچوارچێوەی ژوورەکەدا. کە لەدەستپێکی دا لەسەر ئاماژەکردنی شـوێنی دیـاری کراو سەر دەکەویت....کەهاوکارەکەت ژوورەکە بەجێ دەهێڵێ لەکاتی ڕاهێنـان دا، لەوکاتەدا ئاشکرا دەبێ کەلە تواناد‌ا دەبێت تێبینی بوونی لەرینەوەکانی بکەیت کاتێك لەناو ژوورەکەدا دەبێت.

ڕاهێنانی ژمارە -٢- لەهەست کردنی کەسەکاندا بەکۆمەڵ

ئەم ڕاهێنانە بەدرێژکراوە دەژمێردرێ بۆ راهێنانی پێشوو.کەدوای پەرە پێـدانی تواناکـەت لـەدیاری کردنـی شوێنی کەسێك دا لەژوورەکەدا، کاربکە لەسەر دیاری کردنی شوێوەکە پتر لەکەسەکە، ئەگەر ژمارەیـەك کەسـی تیانەبێت.هەرووەکو ئەوبارەی لەڕاهێنانی یەکەم دا کرا بەستنی چاوی یەکێ لەکەسـەکان لەکاتێکـدا دەکـرێ لێدوانی تیادا درێژە هەبێ، دوایی ئەوەی کەهەموو بەئارامی دەڕۆن بەدەوری ژوورەکەدا. ئە نجا کاتێك کەسەکە

**دەڵێت بوەستە هەموو بەجێ ماوەکان شوێنەکانیان دەگرن و پارێزگاری لەسەر بێ دەنگی دەکەن. کە پەندوەرگرتن لێرەدا ئەوەیە دیاری کردنی وورده بۆ شوێنی هەرتاکێك لەتاکەکانی کۆمەڵەکە..کەلەسەرەتادا هەوڵەکەت بۆ هەست پێکردنی شوێنەکانی کۆمەڵەکەیە، لەسەرتە کە پارێزی بکەیت لەدوورابیەکەوە کەلە پێنج مەتر کەمتر نەبێت لەنێوان تۆو کەسەکەدا کەلەتاکەکانی کۆمەڵەکەیە..کەبە پێ هەستانی بەتوانادەبیت لەسەر هەست کردنی کایەی ڕووناکی هەرکەسێك.هەروەها لەگەڵ پێشکەوتندا لەهەست پێ کردنی کایەی ڕووناکی کەسەکانی تردا، بانگهێشتی ئەندامەکانی کۆمەڵەکە بکە بەکەم کردنەوەی دوورابیەکان، کەلەنێوانیان دایە کەرەت لەدوای کەرت لەکاتی بەجێ هێنانی ڕاهێنانەکەدا.کەکاتێك سەرکەوتنێکی باش لەڕوانگەی کایەکانی ڕووناکی یەوە بەدەست دێت، هەمیشە خۆت دەبینیتەوە لەتوانین لەسەر دیاری کردنی کایەی ڕووناکی تایبەت بە هەر کەسێك لەتاکەکانی کۆمەڵەکە هەتاوەکو ڕاستە وخۆ هەموویان یەك بە پاڵ یەکەوە وەستابن.**

**ڕاهێنانی ژمارە -٣- لەهەست پێ کردنی شتەشاراوەکاندا بەکۆمەڵ**

**پێش ئەوەی بەکۆمەلەکەت بگەیت، بانگی یەکێ لەکەسەکان بکە هەستێ بەشۆردنەوەی دووشت لەژووری میواندا. یەکەم جار بانگی هاوکارەکان بکە هۆشیانە هەست بکەن بەشوێنی دووشتەکە، دوای ئەوەش داوایان لێ بکە بڕیارلەشوێنەکانیان بدەن. ئەم ڕاهێنانە بەهۆکارێکی باش دەژمێردرێ بۆ پەرەپێدانی توانا لەسەر دیاری کردنی جێگەی شتە شاراوەکان، .بۆیە کەووشەی ( لەکوێیە )لێرەدا گرنگترە لەووشەی ( چی ) کەهەستیاریەکمان لایە ( خۆپارێزیەك ) بۆ بەکارهێنانی ژیرویژی لەخەملاندنی شوێنی بوونی شتەکان، بۆیە لەسەرتە کەداوا لەکەسێك بکەیت شتەکان لەشوێنێکی چاوەڕوان نەکراودا بشاریتەوە. بۆ نموونە ئاسایی نییە کەدەرزیەك لەپشتی پارچەیەك لەکەل و پەل بدەیت یان لە پشتی پەرتوك خانە بدەیت . پتر لەدوو خولەك لەهەست پێ کردنی شوێنی شتەشاراوەکان بەسەر مەبە. کەئاسایانە لەشێوە پێوەگرتنی یەکەم دا ڕاستی دەدۆزیتەوە ئەنجا لێرەدا بۆ دڵنیابوون لەدوورخستنەوەی هەر ئاکارێکدەبێ بۆ هاوبیری ، دڵنیادەبی کەکەسەکەی هەڵدەستێ بەشاردنەوەی شتەکان لەچوارچێوەی کۆمەڵەکەت دا نی یە، کەبەم ڕیگەیە دەتوانی تواناکەت پەرەپێ بدەیت لەسەر هەست پێ کردنی شتەکان .**

**ڕاهێنانی ژمارە-٤- لەهەست پێ کردنی ڕەنگەکەکاندا بەکۆمەڵ**

**هەشت پارچە کوتاڵ ( قوماش ) بەڕەنگی جیاواز وەربگرە بەمەرجێ چنراوەکان لەهەمان ڕیس بن ودروست کرابن بەبێ جیاوازی ڕەنگەکانیان کەڕیسە سروشتیەکانی وەکو خوری وئاوریشم ئامادەبکرێ باشترە لەچنراوەکانی دروست کراو.ئە نجا چاوی بەشداربووەکان تەواو دەبەسترێ....کەئامانج ئەوەیە خەملاندنی ڕەنگی هەر پارچەیەك بێت. زانراوە کەهەر ڕەنگێ شە پۆل دەداتەوە بەلەرینەوەی جیاواز لەوەی تر.بۆیە کەهەست کردن بەهەر ڕەنگی جیاوازە لەوەی تر. بۆنموونە زۆرجار ڕەنگی سور بەراورد دەکرێ بەگەرماییەك لە بەرکەوتندالە**

کاتێــــك دا ڕەنگـــــی ســــــەوز زۆرتـــــر فێنکــــــە لەبەرکەوتنیدا .نابێ بەشـداربوان چـاوگی ( نمونـەی ) هیچ ڕەنگێ ( پارچە پەڕۆکە ) هەڵگرن بۆماوەیەك زۆرتر لە ( ١٠ ) چرکە.دوای ئەوە دەسـت دەکـات بەنوسـینەوەی ئەو ڕەنگەی باوەڕی پێیەتی. لەوکاتەدا دەبێ هەرکەسێ کـە بەسـەر هەریـەك لـەو چـاوگە ( پارچـەکوتاڵە ) چنراوەدا تێپەڕ بێت، ئە نجا دوای لابردنی بەستەرەکە لەسەر چاویان دەست دەکەن بەبـەراوردی کاردانـەوەیان لەگەڵ زنجیرەیەکی تایبەت بەڕەنگەکان، کەدوای چەندهەوڵێك هەست پێ کردنی ڕەنگەکە فەرمانێکی پوختـە کراو دەبێ.

ڕاهێنانی ژمارە -٥- لەهەست کردنی کارتی یاری کردندا ( تاك وکۆمەڵ )

کۆمەڵێك لەکاخەزی یاری کـردن لەدەسـتت دا هـەڵ بگـرە کەڕووەکـەی لەبەرچـاونەبێت و پـشتی کارتـەکان ( کاخەزەکان ) ڕووی لەچاوت بێت. چاوت دا بخەو هەوڵی ڕوون کردنەوەی هۆشت بدە وپێشوازی یەکەم ڕەنگ بکـە کەبەهۆشت دا دێت. هەستە بەبەرزکردنـەوەی کارتەکـە بـۆ دڵنیابوونـەوە لەدروسـتی هەڵـسەنگاندنەکەت دا ئە نجا پێکانەکانت لەسەر کاخەزێ لەگەڵ هەر کەرەتێکدا تۆمار بکە وتاکی بکەرەوە بەسەر کۆمەڵە کارتەکانی کەهەڵی دەگریت دیسان مێژوو لەسەر کارتی تۆمارکردنی پێکانـەکان بنوسـە وتێبینـی خولیـات بکـە لەگـەڵ کەشەکەتدا یان هەرشتێکی تر کەکارتێکردن لەسەر ئە نجامەکان بکـات وەکـو ژاوە ژاو.دیـسان تێبینـی بکـە کەشێوەیەکی تایبەتت لایە لە وەڵام دانەوەدا یان نا. نمونەش لەسەر ئەوە، ئەگەر هەستایت بەخەملاندنی یەك لەدوای یەك بۆ ئەو کارتەی کەکارتی مەبەست دەهێنێت، کە پێویست دەبێ لەبەر ئەوەی هەموار کردنێك بـەجێ دەهێنێ.کەدوای پێهەستانی ئەم ڕاهێنانەت لەسەر دووڕەنگەکە، پێش بکەوە بەرەو بەجێ هێنـانی تـر لەسـەر چوار ڕەنگەکە، کاتێك هەز دەکەیت لەجیاکردنەوەی نێوان ئەو کارانەی کەوێنەیان هەڵدەگرێ. لەگەڵ ئەوانەی کەژمارەکان هەڵدەگرێ.

ڕاهێنانی ژمارە -٦- لەهەست پێ کردنی کارتەکانی یاری کردندا ( بەکۆمەڵ )

خواستی بەجێ هێنانی ئەم ڕاهێنانە دەبێ لەدابەش کردنی کۆمەڵێك بێت بۆچەند کۆمەڵێك پێك هاتبن لەسـێ کەسان کەڕۆڵەکانی وەر گرو نێرەر وتۆمارکەر پێك بێنن ئە نجا ئەگەر لەوێدا کەسەکان تەواو نـەبوون، دەشـێ بۆیەك کەس ڕۆڵی نێرەر وتۆمارکەر پێك بهێنێ، لەکۆمەڵەکەی خۆی وکۆمەڵەکانی تردا کە پێك هاتووە لـەدوو کەس. وەرگر بەهەڵگێڕانەوەی کۆمەڵێك لەکارتەکان وهەڵبژاردنی دەدانە لێیـان هەڵدەسـتێ وداى دەنـێ لەسـەر شێوەی کەوانەیی جوت لەسەر ڕووەکەی بـەبێ تـێ ڕوانـین بـۆی. دوای ئـەوەی وەرگـر خـۆی خاودەکاتـەوە بـۆ گواستنەوەی بۆ باریکی نائاوەزی کەئەوەش ئامادە بونێکە بۆ پێشوازی شێوە پێوەگرتنەکان، لەکاتێکدا لەسەر مێزەکە تەماشای دەکارتە دەکات ، هەروەها لەکاتی ئامادەبوون دا وەرگر هەردوو دەستی دادەنێ لەسەر کـارتی یەکەم وچاوەکانیشی داخراوە، ئە نجا بەیەکەم شێوە پێـوەگرتنی کـەدێت بـۆ ئـاوەزی ئامـاژەدەدات.کەسـەکە هەڵدەستێ بەتۆمارکردنی وەڵام. ئە نجا دوای ئەوە دەڕوانێ بۆ کارتەکە و ژمارەی ڕاسـتینە تۆمـار دەکـات وداى

دەنێ بەتەنیشت وەڵامی هەست پێکراوەوە کەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك دەربکەوێ کەلەوەڵامەکەدا کە دروستە، یان نادروستە. بەدەربڕینێکی تر، دەبێ روخساری خاڵی بێت لەهەردەربڕینێك واتە ڕووەکەی بۆ دەرکەوێ کەبە یادیدا دەگەڕێت (وەکو ڕوخسارێکی شارەزا لەیاری پۆکەردا).

ئەم شێوازە لەسەر هەر دەکارتەکە بەکاردێت هەروەها لەسەر کەسی وەرگرەکە بە وردبێت لەچاوەدێری هەست کردنەکانی ناوەکیدا وبیرەکانی کوێرانەیدا، ئاماژە کردنێکە بۆی کاتێك ڕیکەوتی دەکەکات ولەسەر ئەو ڕێڕەوە دەتوانی تۆماری تێبینیەکانی کردبێ.کەوێنە وبیرەکانی پیشان دراو دەردەکەوێ یان نابەستراوەن دەشێ کەبگۆڕدرێن بۆ زانیاریەکانی دەروونی دروست. کەلەسەر ڕوویەك بێت پەیوەندی نەبێ بەراهێنانی کارتەکانەوە یان پێچەوانەکان بن بۆ نواندنەکان یان ژمارەی کارتەکە بێت هەتا ئەگەر خەملاندنەکان هەڵەبێت. ئە نجا لەکۆتایی گەشتی یەکەم جاری دە کارتەکان، دەست بکە بەگفتوگۆ کردنی ئە نجامەکان بەکورتی وەکو کۆمەڵەیەکی تەواو کەدوایی ئەو ئاڵوگۆر کردنی ڕۆڵ بینینیەکان تەواو دەبێ ومشت ومڕەکە چەندبارە دەبێتەوە هەتا هەموو کەس بتوانێ لەئەندامانی کۆمەڵەکە ڕۆڵی وەرگر وەربگرن. کەدەشێ هەمە جۆری ئەم ڕاهێنانە وەکو ئەوبارەبێت کەلەڕاهێنانی ژمارە پێنج دایە. واتە تەنها دەڕواندرێ بۆ ڕەنگەکە و پاشان شێوەکەی کەهەرپێکانێك پتر لەسەر (دووپیکاندنی دروست بێت) کەئەویش پەیوەندی نیەیە بەکرداری. ڕێکەوتەوە- کەلەڕاستیدا ئە نجامەکان هێندەی گرنگی پێ هەڵستانیڕاهێنانەکە خۆی گرنگی نییە.

ڕاهێنانی ژمارە -٧- لەهەست پێ کردنی کارتەکانی زینەردا (تاك یان کۆ)

ئەم ڕاهێنانە کۆمەڵێك لە ڕاهێنانەکانی پەیبردنەکانی هەستی باڵا دەخوازێ...کە پێك دێ لەکۆمەڵێك لەکارتەکانی پەیبردنەکانی هەستی باڵا کە (٢٥) کارتە وناوی کارتەکانی زینەری بەسەردا بڕدراوە کە پێنج نواندن هەڵدەگرێ ئەویش ئەستێرە وهێڵەکانی شەپۆلاوی وخاچ وبازنە وچوارگۆشەیە هەروەکو ئەو بارەی لەگەڵ یاری کردن بەکارتەکانی ئاسایی هەیە، دەست بکە بەخەملاندنی نوینراوی سەر هەرکارتێك بەئاراستەی ناودەستت ئە نجا بەزنجیرەیی دەست بکە بەهەڵسەنگاندنی ئە نجامەکان.تێبینی بکە کە بەتوانایت لەسەر وەرگرتنی نوێنراوێکی دیاری کراو لەسەر ڕوویەکی زۆرتر لەوی تر. ئەگەر بارەکە وابێت، بیربکەرەوە بەگرنگی پێدانی ئەم نواندنە سەبارەت بەخۆت.ئە نجا ئەگەر پێهەستانی ڕاهێنانەکەت لەگەڵ کەسی بەشدار بووەکەت بێت، ئەوا لەتواناتدایە کەیاری بەکارتەکان بکەیت بۆ پەرە پێدانی شارەزاییەکەت.....هەڵ بستە بەنوسینەوەی ئەو نواندنەی کەلە کەسی بەشداربووەکەت وەرگرتووە ولەکۆتایدا تێبینیەکان بەراووردبکە....کە خواستی گەیشتن لەسەر کۆی گشتی سەرکەوتنی باشە، کە پێویستە بە ڕاهێنانەکە هەڵ سیت تا ئەو پەڕی دە کەرەت.

ڕاهێنانی ژمارە -٨- لەهەست پێ کردنی پارەکاندا (تاك یان کۆ)

کەسەکان دابەش بکە بۆ چەند کۆمەڵێك وپێك هاتبن لەدووکەس ویەکیان ڕۆڵی وەرگرو ئەوی تریان ڕۆڵی نێرەر بگیرێ. دەست بکە بەهەڵبژاردنی دوانزدە پارەی جیاوازو دابەشی بکە بۆ دوو کۆمەڵی یەکسان ولەیەك چوو لەگەڵ یەکتریدا (مەبەست پارەی کانزایییە) دووپارچەی کاخەز ڕابکێشە کە هەریەکەیان دابەش بکەبە دوانزدە چوارگۆشەوە لەگەڵ کۆمەڵە پارەی دانراو لەسەر مێزێك کەلەبەردەمی هەردووکیاندایە. نێرەر دەست دەکات بەهەڵبژاردنی پارەیەك ودای دەنێ لەسەر یەکێ لەچارگۆشەکان، پاشان بە ڕوانینی سەرنج لەسەری دەدات لەکاتێکدا وەرگر تیا هەڵدەستێت بەوەرگرتنی وێنەیەك. وەرگر هەوڵی بەجێهێنانی کاری نێرەر دەدات. کردارەکەش بە پێی ئەوە درێژەی دەبێت هەتا هەموو چوارگۆشەکان دەکرێتەوە بەدوانزدە پارچە دراوی کانزایی.....دوای ئەوە بەراورد بەجێ دەهێنرێ....کەئەگەر لەوێدا زۆرتر لە دووپارچەی دراو لەیەك پێرلە هەمان شوێندا بەدوو کاخەز لەچوارگۆشە تایبەتەکاندا هەبێت ، ئەوا ئەمەش مانای کەجۆرێك لەوەرگرتن بەدی دێت.

راهێنانی ژمارە -٩- لەهەست پێ کردنی کەسەکان بەناوەکان (کۆمەڵێ)

کەسێك هەڵبژێرە بۆ بەجێ هێنانی ڕۆڵی سەرکردە، دوای ئەوە ئەوەی ماوەتەوە لەکۆمەڵەکە هەڵدەستن بۆ بەجێ گەیاندنی ڕاهێنانەکانی لەش خواربوونەوە لەگەڵیدا بەوەی هەریەکێ لەوانە لەباری وەرگتن دابن سەرکردە بەدەنگێکی بیستراوەوە هاواردەکات بەناوی یەکێ لەکەسەکان کەدەیان ناسێت، لەکاتێکدا ئەندامەکانی تری کۆمەڵەکە ناناسێت.ئە نجا دوای ئەوەی سەرکردەکە بەناوی کەسێکەوە بەدەنگی بەرزهاوار دەکات، ئەرك دەبێ لەسەر ئەندامانی کۆمەڵەکە سەرنج لەسەر ئەم کەسەبدەن بۆ ماوەی خولەکێك.ئە نجا دوای بەسەر بردنی ئەو خولەکە لەسەرنجدان، ئەوا هەر بەشداربوویەك دەست دەکات بەنوسینەوەی هەر شێوە پێوەگرتنێك کەوەری دەگرێت دەربارەی ئەوکەسە نەناسراوە.باشتر وایە نوسینەوەی شێوە پێوەگرتنەکان بکرێت لەجیاتی شوێن کەوتنی ئاشکرای یەك لەدوای یەك، لەبەر ئەوەی لاردەبین بۆ ئەو شتەی کەسانی تر دەیڵێن.کاتێکی دیاری کراو بۆ نوسینەوەی شێوە پێوەگرتنەکان تایبەت بکە.دوو خوولەك بەس دەبێ چونکە دوای بەسەر بردنی دوو خوولەکەکە ئاوەزی هۆشیاریت هەڵدەستی بەهەڵخستن وپیشان دان...دوای ئەوە هەر بەشدار بوویەك دەست دەکات بەخوێندنەوەی تێبینیەکانی بەدەنگی بەرز.

پاشان سەرکردەکە لێدوان ئەکات لەسەر هەموو ووردەیەك و ناوردەیەك-دەشێ چەندبارە کردنەوەی ڕاهێنانەکە بەگۆرانی سەرکردەکە بێت. گرنگ ئەوەیە لێرەدا لەلای سەرکردەکە زانیاری کەسی زۆر بێت دەربارەی ئەو کەسەی کەناوی خۆی ڕادەگەیەنێ، لەبەر ئەوەی بەوەدا دەشێ لەمتمانەوە بێت، واتە پەیبردنیك بەشدار بوان دەری دەخەن. کەدیسان گرنگ ئەوەیە سەبارەت بەبەشدار بوون ئەو کەسە بەتەواوی فەراموش بکەن، کەبەوەش دا هەرچی بەهۆشیاندا دێت دەربارەی پێش کاتینە ئەوە لەناکاوەوە دەبێ کە لەسەر بێ بناغەیە.

راهێنانی ژمارە -١٠- لەهەست پێ کردنی بارەکانی سۆزداریدا (کۆمەڵ)

**دوو بان دانیش ( کورسی ) بەرانبەر بەیەك دابنێ لەگەڵ بەجێ هێشتنی ماوەی نێوانیان تارێگەی دوو کەسەکەبێت دابنیشن بەبێ ئەوەی بەریەك بکەون. یەکێ لەئەندامانی کۆمەڵەکە هەڵبژێرە بۆ دانیشتن لەسەر یەکێ لەباندانیشەکان لەگەڵ بەستنی چاویدا. کەدوای ئەوەی ئەوانی تر بەدەوریدا دەسوڕینەوە.**

**هەڵبژاردنی یەکێکیان بۆ دانیشتندەکرێ، کەبەئارامی تەواو لەسەر باندانیشی بەرانبەر دەبێ. ئە نجا لێرەدا لەسەر وەگرە هەردوو چاوی بەسترابێ کەدەستی درێژکردبێ بەرێکی بۆپێشەوە و دەبێ رووی لە پی دەستی بۆ سەرەوەبێت. هەروەها لەسەرکەسیکی ترە کەدەستی دانێ لەسەر لە پی دەستی وەرگر، بەبەرکەوتنێکی کەم، واتە تەنها بەس بێت بۆ ئەوەی وەرگر پەی بەلەرینەوەکانی کەسەکەی تر بەرێت، دوای ئەوە وەرگر هەڵدەستێ بەهەواڵ پێ دا نمان لەوەی تەواو لەو کەسەوە وەرگیراوە، لێرەدا ناوی کەسی دانیشتوو گرنگ نی یە بەلاّم هەست کردنەکان وەرگرتنیان لەو کەسەوە گرنگ دەبێ، ئە نجا لەسەر وەرگرە هەر دووچاوی بەستبێ کە پەیوەست بێت لەسەر باری سۆزداری بۆ ئەوکەسەی هەستی پێ دەکات.....بۆ نموونە ئەو هەست دەکات کەسەکە بەختیارە یان ترسی لێ نیشتووە یان بێ ئومێدە؟ دوای ئەوەی کەکەسی چاوبەستراو هاواردەکات بۆ هەموو ئەوەی هەستی پێ دەکات دەربارەی ئەوکەسەی دانیشتووە لەبەر دەمیدا، کەزۆر جار خولەکێك دەخایەنێ، ئە نجا بەستەرەکە لەسەرچاوی لادەبرێ کەکەسەکەی تربانگ دەکات بۆ لێدوان وئاخافتن لەسەر وردی شێوە پێوە گرتنەکان کەوەری گرتووە.... ڕاهێنانەکە چەندبارە بکەرەوە لەسەر ئەندامانی کۆمەڵە هەموویان تا خواستێك بێت کەبۆ هەرتاکی هەلێکی بۆ هەست پێ کردن هەبێ.**

## دەروونە خەملاّندن - psycho metry

**دەروونە خەملاّندن ئەو توانایەیە لەسەر چوونە ناو لەرینەوەکانی کەسێکی ترەوە لەرێگەی شتێکەوە کەبۆ ئەوکەسە دەگەرێتەوە...کەهەموو شتێ لەدەورو بەرمان لەرینەوەکان دەمژێ جائەگەر ( جل وبەرگ بێت، یان زێرو زیوبێت، کەل و پەل بێت...تاد ) کە هەرچەند بەرکەوتنی سۆزداری بۆ خاوەنەکەی لەسەر ئەوشتەگەورەبێت واتە هەرچەند ماوەی خاوەن داریەتی درێژتربێت، لەرینەوەکان هێزی زۆرتری دەبێ. دەروونە خەملاّندن دەشێ لەشتێکدا بخوێنرێتەوە، بەکار کەرێکی یاریدەر دەژمێردرێ کاتێك لەوێ دا زۆرتر لەکەسێك لەژوورەکەدا هەبێ.. کەبەهۆبەندی ( هەست پێ کردنی )شتەکەوە یان خوێندنەوەیەوە زۆر تر دڵنیادەبێ لەزانینی خاوەنی شتەکە هەتاوەکو کەسانی تریش کە لەژوورەکەدابن. کەدەروونە خەملاّندن یارمەتی دەدات لەسەر هەست پێ کردنی ئەو کەسەی کەئامادەنی یەو نادیارە ئەوەش لەماوەی خوێندنەوەی یەکێ لەشتەکانی بۆ گەراوەی دەبێ کەهی ئەو کەسە نادیارەیە.**

**ڕاهێنانی ژمارە -١- لەخەملاّندنی دەروونیدا ( بەکۆمەڵ )**

**هەریەکە لەکۆمەڵەکە بەجیا بانگ بکە، کەهەریەکەیان پارچەیەك لەزێرو زیو دابنێن لە دەفرێکدا کەماوەیەکی زۆرە بەکاری هێناوە، پاشان کۆمەڵە کە بەتەواوی دای دە پۆشێ گرنگ ئەوەیە لێرەدا کەخاوەن داری**

پارچە زێڕ وزیوەکان هـەموی دەگەڕێتـەوە بـۆ یـەك کەس. بەوەی لەوێـدا یـەك نموونـە لـە لەرینـەوەکان هەیە. لەبەر ئەوەی بوونی زۆرتر لە نمونەیەك لە لەرینەوەکان کارەکە تێکـەڵ دەکـات، هـەروەکو ئـەوبارەی لە پە نجە مۆردا هەیە.... دوای ئەوە هەرکەسە پارچەیەك لەزێڕ وزیوەکان لەدەفرەکە هەڵدەبژێرێ بۆ کارکردن لەسەری. ئە نجا ئەگەر یەکێ لەکەسەکان زانـی کە پارچـەکە دەگەڕیتـەوە بـۆ کەسـیك، ئـەوا لـە سـەریەتی کەبەهێمنی یەك لەشتە نەناسراوەکان کە خاوەنداریەکەی سەبارەت بەوەهەڵبژێرێ. نابێ خاوەن داری شتەکان بخەملێنیت بەڵکو، لەجیاتی ئەوە لەسەرتە هۆشت پاك بکەیتەوە وهەڵی بگریت لەدەستت دا وبانگی هۆشت بکە ڕای بگەیەنێ.. ئە نجا دەست بکە بەنوسینەوەی هەرشتێ کەبەهۆشت دێت...تێبینی ئەو ڕێگەیە بکە کە ئەوشتەی پێ دەگریت، ئەگەر بەهێزێکەوە بیگریت ئەوا مانای ئەوەیـە کەخاوەنەکـەی سـروش شوشـێوە پێوەگرتنی تیـژ وتوندە. هەروەها هەڵگرتنی بەئارامی یان جولاندنی لەسەر ڕێڕەوێکی بازنەیی ئەوا مانای ئەوەیـە کـەخاوەن شتەکە سروشتی هێمنە....ئە نجا دیسان تێبینی ئەوە بکە کەئەوشـتە بەگـەرمی یـان بەسـاردی هەسـتی پـێ دەکەیت. کاتژمێری دەستی بەباشتردادەنرێ دەشێ بەکارهێنانی لەم جۆرەبێت لەڕاهێنانەکانـدا لەبـەر ئـەوەی بەشەکانی جولاوەیە لەدەستدا کەبەوەش دا لەرینـەوەکانی خێراتـر وەردەگریـت زۆرتـر لەهـەر شـتێکی تـری کەناجولێت وەکو کاتژمێرەکە.هەروەها سەبارەت بەوکەسانەی زێڕو زیویان نی یە. ئەوا لەتوانادا دەبـێ کلیلـە یان پێنووسی نوسین بەکاربهێنن ...کەڕاهێنانەکە دەست پێ دەکات بەهەڵگرتنی شتێك بۆ ماوەی سی چرکە دوای ئەوەی نوسینەوەی شێوە پێوەگرتنەکان دەبێ لەدوو خولـەك پـتر نەخایـەنێت.ئـە نجا دوای کۆتـایی کـرداری بەجێگەیاندنی شێوە پێوەگرتنەکانی کەسەکان، کە بەدەنگی بەرز دەدوێ بەو پەڕی ووردی شێوە پێوەگرتنەکانەوە بێت. ئەم ڕاهێنانە بەزۆری ئەگەرەکانی یەوە پێناسە دەکرێت، لەبەر ئەوەی لەتوانادا دەبێ کەدرێژە بدات لـە گۆرانی شتەکانی هەیوو لەدەفرەکەدا.

ڕاهێنانی ژمارە -٢- لەخەملاندنی دەروونی بەکۆمەڵدا

هەلبستە بەهەڵبژاردنی سێ شتی ڕووتەخت ی وەکو کارت، ئە نجا بیپارێزە لەسێ کیسدا بەگەواڵەی ( قەوارەی ) ئاسایی وهەرکیسەش ئاماژەی بکە بەژمارەیەك یـان پیتێـك بـۆ ئـەوەی بتـوانی بزانیـت هەرکیسـەیەك چـی تێدایە.ئەوسێ شتە بەرگ تێ بگرە لەکاخەزێ پێش ئەوەی بیخەیتە ناو کیسەکەوە بۆ ئـەوەی زانینـی شـتەکە لەکیسەکەوە نەستەم بێت.کەئەم ڕاهێنانە ئامانجی وەرگرتنی شتێکە دەربارەی کیسی ئەوشتە یان دەربارەی ئەو کەسانەی پەیوەندیان پێوە هەیە.کاربکە لەسەر تێپەڕ کردنی ئەو کیسانە لەسەر بەشداربووان، داوایان لێ بکە یەك خولەك بەسەر ببەن بۆهەر یەکەیان...هەروەها لەسەر هەرکەسیکە کەبنوسێت لەوەی پێی لەهەر کیسێکەوە دەگات...ئە نجا هەوالی بەشدار بووان بدە کەئەوشتە هەڵ نەسەنگێنن ئە نجا دوایی کە ڕێگـە بـدات بـۆ هـەر کەسـێ هـەلی هـەبێ کیـسەکە دەسـت لێ دەدەیـت، شـێوە پێوەگرتنەکانی پەیوەسـت بەکیـسەی ژمـارە -١- بخوێنەرەوە...ئە نجا دوای ئەوەی کەهەموو کەسێ شـێوە پێوەگرتنەکانی دەربـارەی ئـەو کیـسەیە خوێنـدەوە،

هەستە بەكردنەوەی كیسەكە و ڕوونی بكـەرەوە چـی تێدایە، هەمان ڕێگا لەسـەر دووكیـسەكەی تـر تـاكی بكەرەوە. ئەم ڕاهێنانە دەوەستێتەوە لەسەر تواناكەت لەخەیاڵ كردنەوەدا ولەژمارەی كیسەكاندا.

ڕاهێنانی ژمارە -٣- لەخەملاندنی دەروونیدا ( بەكۆمەڵ )

ئەم ڕاهێنانە لەڕاهێنانی پێشوو دەچێ بەدەرلەوەی كەشتەگەورەكان دەگریتەوە.یەكێ لەتاكـەكانی كۆمەڵەكـە هەڵدەستێ بەبەرگ تێگرتنی شەش شت لەكتویەكی تاكدا كەدەست دەكات بەژمارە لێدانی هەریەكـەیان. دەبـێ بەرگ تێگرتنی كتووەكە ڕێگری زانینی وبەدیار بوونی ناو كتووەكە بیێت. بۆهیچ كەس نابێت كەهەوڵ بدات ناو كتووەكەی بزانێت بەهەر شێوەیەك لەشێوەكان بێت پێش دەست پێكردنی ڕاهێنانەكە.

دەبێ كەژمارەكان گەورەبن وكتووەكەش بەشێوەدانرابێت ڕێگـە بەهەمووتاكـەكانی كۆمەڵەكـە بـدات بـەڕوونی ببیبینن .هەموو كەسێكی بەشدار بوو پێنوس وكاخەزیك وەردەگرێ ودادەنیشی بەلەش خاوی بۆ گواستنەوەی بـۆ باری نا ئاوەزی.كەلەدەمی ئامادەبووندا ئەرك دەبێ لەسەر هەموو كەسـێ كەهـەڵی ببـژێرێ وبـەهێمنی یـەكێ لەكتووەكان وژمارەكەی لەسەرەوەی كاخەزەكەی بنوسێ كەبەتەماشا كردنی سـەرنج دەدات بـە پێی چوارچـێوەی پەیبرنی ناوەرۆكی ئەو كتووە لەسەر ڕووی تایبـەت. بەدەسـت دەكـرێ بە پێـشنیاركردنی پرسـیاركردن لـەناو كتووەكەدا..ئایا بە پێی گەواڵەكەی كێشەكەی گرانە؟ ئایا ئەوە لەكانزایە یـان لەتەختەیـە؟ ئایـا شـێوەكەی ئاڵۆزە یان سادەیە؟ دوای هەموو پرسیارێك ماوەیەك لەكات وازلێ بهێنە. بۆ ئەوەی ڕێگە بەوەلام دانەوە بـدەیت تا دەربكەوێت بۆ ئاوەزی هۆشیاریت ، ئە نجا خەیاڵ بكەوە كەئاوەزی هۆشیاریت دەردەچێ لەسـەر ئارەزوویـەك كەلەداوی جالجاڵۆكە دەچێت ودەچێتە كتووەكەوە وخـۆی ڕا پـێچ دەكاتــە نـاو كتووەكـەوە بـۆ ناوئاخنەكـەی، كەكاردەكات وەكو وایەریك وداویك و زانیاری پێدا پەخش دەكرێ بۆ ئاوەزی وەرگـر. لەسـەر كاخـەزیك هـەموو شێوە پێوەگرتنەكان وەكو شێوەیان مادە یان ڕەنگ یان هەر بیرۆكەیەك دەردەكەوێ لەسـەر هۆشـت تۆمـار بكـە. ڕەنگە ئارەزووبكەیت لەوێنەكێشانی وێنەیەكدا لەجیاتی نوسینی. لەسەر هەموو كەسەكە بەڕاهێنانەكـە هـەڵ بستێ بەهەر ڕێگەیەككە ئاسان دەیبینێ. ئە نجا هەرچەند ڕێگەكە ئاسانتر بێت وەرگـر لـەباری خاوبوونـەوەدا باشترە بەوەی ڕیگادەدات بەزانیاریەكان نزیك ببنەوە بەتەواوی كـەلێرەدا گـرژی كۆسـپێك لـەنێوان دەروونـی ناوەكی ودەرەكی دا دەسازێنێ....كەهەرچەند ڕێگای پێ هەستانی ڕاهێنانەكە ئاسانتربێت كرداری پەرە پێـدانی ئەم شارەزایی یە بەشێوەی خێراترە. كەخواستی چوونە ناوەوەی ڕەگەزی هەمە جۆری، هەر تـاكیكی كۆمەڵەكـە دەتوانێ كەبەشداری بكات بەشتێكی بچكۆلە كـە بـەس بێـت بـۆ دانـانی لـە نـاو بـاوەلی پـێلاودا...ئـە نجا لەسەركەسەكەیە كەشتەكان ئامادە دەكات تا لەناو باوەلی پێلاوەكانـدا دای بنـێ لەگـەڵ دانـانی ژمارەكـان لەدەرەوەی دا كەئەمەش هەمە جۆری دەنوێنێ سەرباری ووروژاندنی تایبـەت بەئاشـكرا كردنـی هـەر باوەلیـك لەباوەڵەكان كەناو ئاخنەكەی شتێكی گەراوە دەبێ بۆ هەر كەسـێك...ئـەو ئاشـكراكردنەش وەسـتاوە لەسـەر بنچینەی پێناسەكردن. ئەگەر دڵنیا بویت لەباوەڵەكە شتێكی تێدایە كە دەگەڕێتەوە بـۆ تـۆ، ئـەوا لەسـەرتە

کەتێپەڕی بکەیت ودەست بەکاربکەیت لەسەر باوەڵەکەی تر.دەبێ کەلەوێدا کاتێکی دیاری کراو هەبێ لەدوو خولەك تێپەڕنەکات....ئەنجا کاتێك کاتەکە ڕادەگەیەنرێ، لەوکاتەدا پێویست دەکات لەسەر هەرتاکێ تا بەسەرنجەکەیەوە بگوێزیتەوە بۆ باوەڵەکەی تر.

ڕاهێنانی ژمارە -٤- لەخەملاندنی دەروونیدا (بەکۆمەڵ)

خوێندنەوەی نامەکان یان تێبینیەکان بەراهێنانێك دەژمێردرێ دەتوانێ لەماوەیەوە بە وەڵامەکان بگەیت بۆ ئەو پرسیارانەی کەگرنگ دەبێت لەلات.کەئاسان کاریە بە پرسیارێك دەست پێ بکەیت کە دەشێ بەرپەرچی بدەیتەوە بەبەڵێ یان نەخێر. هەموو بەشداربویەك پارچەیەکی هاوشێوە لە پێنوس وکاخەزی دەدەیتێ.کەلێرەدا پەرەکانی پەراو بەکەڵك دێت...هەموو کەسێ پرسیارێك دەنوسێ. وەکو( ئایا کارکردن بەدەست دەهێنم کە پێش ڕەویم بۆ کردووە؟ ) دوای ئەوە هەڵدەستێ بە نوشتاندنەوەی کاخەزەکە بۆ نیوەی بۆ ئەوەی پرسیارەکە لەناویدا بمێنێتەوە و ئاماژەیەکی تایبەت لەدەرەوە دەدات. کەئەوکەسەی پرسیارەکە دەنوسێت دەبێ کەبەتەنها لەسەر زانینی لەسەر کاخەزەکەی بەتوانابێت ، لەبەر ئەوەش کەکێشانی وێنەکیان نمونەیەك بۆ ئەستێرە یان ڕۆژ باشترە لەدانانی پیتە سەرەتاییەکان لەو کاتەدا ئەو کاخەزانە دادەنێیت کەبەفەرەنسی پێ دەڵێیت billets .کەماناى تێبینی یەیان نامەیە ، لەتورەکەیەکدا بۆ تێکەڵ کردنیان پێکەوە دوای ئەوەی هەر بەشداربوویەك یەکێك لەو کاخەزانە هەڵدەبژێرێ کەدەست پێ دەکات بە پشکنینی ئامـاژەی جیاکراوە بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کەدەگەڕێتەوە بۆکەسێکی تر. کەلەکاتی هەڵگرتنی نێردراوەکەدایە وبەبێ تەماشاکردن بۆ پرسیارەکە، هەوڵ بدە وەڵامێك دابنێیت.کەدوای پێدانی هەر شێوەپێوە گرتنێك کەوەری دەگریت پرسیارەکە بخوێنەوە بۆ بینینی ئاستی نزیکی لێتەوە.کەوەکو هەمەجۆری پێدانە و دەشێ کەبانگی کۆمەڵەکەت بکەیت بۆ کردنی پرسیارێك کە دەشێ لەبەیەك گەیشتنی داهاتوودا وەڵامی بدەیتەوە....بۆ نمونە پرسیاربکە ئەگەر کەسێك لەخەڵکی پەیوەندی دەکات؟ ئەنجا کاتێك بەکۆمەڵی دووەم دەگەیت واتە لەهەفتەی داهاتوودا، هەواڵ بدە ئەوکەسەی وەڵامەکەت پێ داوە لەوکاتەدا ئەگەر وەڵامەکە ڕاست بێت یان هەڵەبێت...کەئەم ڕاهێنانە دەشێ بەجێ بگەیەنرێ بەئاسانی .کەوابوو ئێمە هەموومان خاوەن پرسیارین وپێویستی بەوەڵامەکانە.

ڕاهێنانی ژمارە -٥- لەهەست پێ کردنی وێنەدا (تاك وکۆ)

هەندێ وێنە بەگەواڵەی (٣×٥) لەناو کیسەداخراوەکاندا دابنێ. پێویستە لەسەر هەر بەشداربوویەك کەکاخەزو پێنوسی لابێت بۆ نوسینەوەی شێوەپێوە گرتنەکان. بەڕاهێنانەکانی لەش خاوبوونەوە هەڵبستە لەگەڵ کۆمەڵەکەتدا، دوای ئەوە لێدوانیان بۆ بکە وفێریانی بکە بەوەی کەهەریەکە لەوان کیسەیەکی داخراوی هەیە لەگەڵ وێنەیەك لەناویدا، هەروەها داوایان لێ بکە خەیاڵ بکەنەوە لەباری لەش خاوبوونەوەی تەواودا، کەچاویان دا بخەن وهەستەکانی ناوەکیان بکەنەوە بۆ وەرگرتنی شێوەپێوەگرتنەکانی تایبەت بەوێنەکە...بۆ نموونە....ڕەنگەکان کامانەن؟ هەروەها سۆزداریەکان کامانەن کە پێی بەراورد دەکرێ؟ بەچی یادتان دێتەوە؟

ئایا لە پشت ئـەووە چیرۆکێك دیـارە؟ دوای ئـەوە لەسـەر هەرکەسێکە لەوانـە شێوە پێوە گرتنـەکانیان لەسەر کاخەزی خۆیان بنوسنەوە...داوایـان لێ بکـە کەبینوسـن لەهـەموو ئەوانـەی بەیادیانـدا دێت بـەبێ وەڵاموکاردانەوە بەڵکو بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ بینوسێتەوە.کەدوای بەسـەربردنی پێـنج خولـەك داوایـان لێ بکـە کیسەکان بکەنەوە. ئەرکە لەسەر هەربەشدار بوویەك کەهەواڵ بەکۆمەڵەکە بدا بەوەی کەلەسەرەتاوە دەیکات واتە پێش پەیرەوکردنی ڕێگاکانی لەش خاوبوونەوە، تا پرسیاریان لێ بکرێت کـەئایا پرسـیاریان لەلاهەیـە کەئەمەش تەنها یاد هێنانەوەیە کاتێك لەسەر بـەجێ هێنـانی بە پەلـەی ڕاهێنـان بـن. دەشـێ لـەو وێنانـە لەگۆڤـارەکاندا یان بڵاوکراوەکانی هونەریدا یان لەکارتەکانی پیرۆزبایدا یان ئـەوانی تـر لەچـاپ کراوەکـان بگەڕێیت...دەبێ وێنەکە کارتێکراو دەربڕاوبێت وخاوەن کارتێکردنیکی سۆزی بەهێز بێت. دیسان تێبینـی بکـە هەمەڕەنگی نائاسایی وسەرنج دانی تیژو یان ڕەگەزی نائاسایی ونواندنی دەوڵەمەندی بەماناکانیـەوە هـەبێت کەدەبێ هەندێ شت ئاسان بێت هەروەها تەواو کراوبێت کەبەلای کەمەوە لە پێنج خاڵی شـایەن بەسـەرنج بێـت واتە بەشێوەکانی تێ ڕوانین بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. کە بەیەك مانا بێت واتە خاوەن یەك بابەت بێت لـەجیاتی ئەوەی بەبابەتی جۆراو جۆربێت تاکارەکە تێکەڵ و پێکـەڵ بکـات ئـە نجا دوای کۆکۆدنـەوەی وێنـەکان ئـەوەی کەلەوانی تر جیادەکرێتەوە دووری بخەوە... ئەگەر کۆمەڵـە وێنـەکان زۆر لەیـەك چـوون.کەئـەوەش کـاری وەرگرەکان تێکەڵ دەکات کەبەشێوەیەك لەسەریان بڕیاردانی چالاکی بـەجێ هێنـان وڕا پەرانـدنیان ئەسـتەم دەبێت. هەروەها لێرەدا دەبێ سەرپەرشتی جیاوازی وێنەکان بکرێت لەچوارچێوەی هەموو کۆمەڵەکەدا جا لەڕەنگ دابێـت یـان بـاری سـۆزداریدا بێـت یـان لـە یـەکیتی بابەتەکـەبێت واتـە ( کـەس یـان گـوڵ یـان شـتی تربێت ) .کەڕا پەڕاندنی ئەم ڕاهێنانە بەشیوەی تاك ئاسان دەبێ دەشێ بەهاورێکەت یاریدە بدرێی تاوێنـەکان لەناو کیسەکان دابنێت.ئە نجا دوای کۆتـایی هاتنی پێنج خولەکی تەرخان کراو بۆ ئەم ڕاهێنانە.لەسەرکەسەکە پێویستە کە پێناسەیەك بدات بـۆ شـێوە پێوە گرتنـەکانی کـەوەری گرتـووە وەڵامـەکانی لەسـەر کاخـەزەکان داناوە.... کەواتە دەرهێنـانی وێنەکان لەکیسەکان دەبێـت بـۆ دانـانی لـەو جێگیریـەدا کەهـەموو دەیبینێـت کەئەوەش لەکاتی تاو توێ کردنی ئە نجامەکاندا دەبێت .

## پاندۆل –ئاراستەگر

پاندۆل ئەو دەستگایەیە دەشێ بەکار بهێنرێ بـۆ گەیـشتن بـەنێردراوەکان لـەدەروونی نـاوەوەت یـان ئـاوەزی ناهۆشیاریت دا، کەبەبێ دەست تێوەردانی ئاوەزی هۆشیاری دەبێ. لەتوانادایە بەکارهێنانی ئاراستەگر بۆ خۆت بێت بۆ گەیشتن لەسەر ئەو وەڵامانەی لەدەروونتدا دەگەرێ یان لەگـەڵ کـەمێکی تردایـە بـۆ گەیـشتن لەسـەر وەڵامەکان بۆ ئەو پرسیارانەی پەیوەستن بەوکەسەوە. لەتواناتدایە ئاراستەگریك ( پاندۆل ) دروسـت بکـەیت. کەئەوەش بەهەڵواسینی تەنیکی کێش دیاری کراو دەبـێ بـە زنجیریکـەوە یـان پەتیکـەوە، ئاسـانترین ڕێگـە بەکارهێنانی دەرزی یە کە دەبەستریتەوە وهەردوو سەری داوە دەزووەکە لەهـەردوو لاوە ڕادەکێـشرێ بـۆ ئـەوەی

یەکسان بێت و درێژاییەکەی (١٢) ئینچ بێت. دوای ئەوە پێویستت بەئامانج ونیشانە....دەرزیە هەڵواسراوەکە بەدەست بگرە، ئەنجا دەستەکەی تر نیشانەبێت.... یان پارچەیەك لەکاخەز بازنەی وێنە کێشراو لەسەری ئامانجەکەت بنوێنێ دەبێ کە پاندۆلەکە بەبەڵێ یان نەخێر وەڵام دەداتەوە بۆیە دارشتنەوەی پرسیارەکان کەلەگەڵ ئەو وەڵامانەدا بڕوات.

راهێنانی ژمارە -١- لە پاندۆڵدا (بەتاك)

باندۆڵەکەت بەبەرزایی یەك دوو ئینچ هەڵبگرە لەسەر نیشانەکەوە وهەوڵ بدە جێ گیری بکەیت.ووشەی (جیگیر) بلێ بەلام

بەئاوەزت یان بەدەنگی بیستراو، هەروەها سەرنجی ئاگایت لەسەروو دەرزیەکە بێت.کە پرسی شڵەژێنەر لێرەدا سەرنجدانی ووزەی ئاوەزیە لەسەر بیرۆکەی جێگیرکردنی دەرزیەکەیە.ئەنجا کاتێك دەرزیەکە جیگیر دەبێ ئەوا پرسیارەکەت بکە کەدەبێ وەڵامی بدرێتەوە بەبەڵێ.. نمونەش لەسەر ئەوە پرسیاردەکەیت ئایا ناوت (........) کوری (....).؟ کەوابوو دەبێ وەڵامت پێ بگات بەبەڵێ پاشان تێبینی ئاراستەکەی بکە کەیەکەم جار دەرزیەکەی پێ دەجولێت....کەئەوەش مانای وایە ئەم ئاراستەیە –بەڵێ –دەنوێنێ.دوای ئەوە پرسیاریك بکە کەوەڵامەکەی نەخێربێت....کەواتە دەبێ وایە دەرزیەکە بەئاراستەی پێچەوانە بجولێت. ئێستا ڕوونی بکەرەوە کام لەم دوولایە مانای بەڵێ و ئەوی تریان مانای نەخێردەدات. بەم ڕاهێنانە هەڵبستە لەهەرکاتێکدا بە پاندۆلەکە کاربکەیت لەبەر ئەوەی هەر دوو ئاراستەی بەڵێ ونەخێر زۆرجار ناگۆریت. لەهەندێ کاتدا کەدەستت دەجولێ کەتێبینی دەکەیت کەئەمەش دەگەرێتەوە بۆ هەستانی ئاوەزی ناوەوە بەدەنگ دان بۆمێشك بۆ ناردنی لێدانەکانی کارەبایی بۆ دەستت بۆ جولاندنی پاندۆلەکە.

پاندۆلەکە یارمەتیت دەدات لە پەیوەندی کردنی ئەوەی لەئاوەزی ناوەوەتدا کەڵەکەکراوە... کەسەرنجدانی پشت بە تۆ دەبەستێ لبۆ نموونە پرسیاریك لەسەر ئاراستەگرەکە پێشنیاربکە پەیوەست بێت بەڕوودانی ئایندەیی یەوە کەتۆ لەڕاستیدایت.ئاوەزی ناوەوت پرسیار دەکات لەوەی دەیەوێ کە ڕووبدات ئاراستەگرەکە پێشگۆیی ناکات بەئایندەوە، بەڵکو تەنها هەواڵت دەداتێ بەوەی ئاوەزی ناوەوە دەیەوێت کەڕوو بدات...کە پاندۆلەکە (ئاراستەگرەکە) بەکەرەستەسەکی بەکەڵك دەژمێردرێ بۆ گەیشتن بەوەی راستی دەیەوێت، بەتاییەت ئەوەی پەیوەستە بەهەلویستەکانی سۆزداریەوە، بۆ نموونە، ڕەنگە بەئاوەزی ناوەوت بیربکەیتەوە بەڕووداوێك بۆی کۆتایی دێت. بەلام ئاراستەگرەکە کاتێك پرسیاری لێ دەکەیت بە پێچەوانەی ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە ئاماژە دەکات.کەئەمەش ئاماژە دەکات بۆ کورەیەك لە ئەو ناکۆکیانەی کەهەن لەناو کەسایەتیەکەتدا کەدەبێ کاربکەیت لەسەر نرخاندنی پرسی هەڵگرتنەکەت بۆ هەر دوو ڕووی ڕوانینی بەریەکەوتن.

ڕاهێنانی ژمارە -٢- لە پاندۆڵ دا(تاکی)

ڕووپەرێك بەبیست پرسـیارەوە دابنــێ.وەڵامـەكانی  كورت كرابێتەوە بەبەڵێ ونەخێر كەئەویش با دەربارەی ڕووداوەكانی ئێستابێت لەژیانتدا...ئەنجا وەڵامە هاتووەكەت لـەئاوەزی هۆشـیاریەوە بەرانبـەر پرسـیارەكە بنوسە دوای ئەوە پاندۆڵەكەت بۆ وەڵام لەسـەر پرسـیارەكە بـەكار بهێنـە پاشـان تێبینـی بكـە ئایـا لـەوێ پێكهاتنێك لەوەڵامدانەوەدا هەیە؟ ئەگەر لەوێدا پێكهاتنێك بەكار نەهاتبوو هەوڵی دۆزینەوەی هۆیەكە بدە. پارێزگاری بكە بەڕوو پەرەكەوە كەدوای كردنەوەی ئەنجامی كـردەوەی بـۆ وەڵام دانــەوەی هۆشـیاریت لەگـەڵ وەڵامدانەوەی پاندۆڵەكە وردەكـاری بكـە...كێتـان بەركـەوتن و پێكـانی زۆرتـری بەدەسـت هێنـا؟ تـۆ یـان پاندۆڵەكە؟.

## ڕاهێنانی ژمارە-٣- لە پاندۆڵدا (تاكی)

لەوێدا بواری تر هەیە بۆ زانیاریـەكان كەیارمـەتی پاندۆڵەكـە دەدات لەگەیـشتن پێـی ئـەویش شـێوەپێوە گرتنەكانی دەروونی بێ هۆشیاریە كە ئاوەزی ناهۆشیاری پێی دەگات لەكەسانی ترەوە. وێنەبەرداری بكە كـەتۆ چیرۆكێكت بیست لەگەلیدا هەست دەكەیت بەوەی بەشێوەیەكی دروست بـۆت نەگوازراوەتــەوە. ڕوو پـەڕێك بـەو پرسیارانە دابنێ كەوەڵامەكانیان كورت كراوەتەوە بەبەڵێ یان نەخێر و پەیوەستە بەهەمان بارەوە. بنموونــە ، ئایا كەسەكە بەتەواوی دەربارەی بابەتەكە هەواڵی پێمدا؟ ئایـا كەسـەكە لەهۆشـیدا درۆ دەكـات؟ درێژەبـدە لە پرسیاركردن داو بانگی پاندۆڵەكە بكە وەڵامت بداتەوە...هەوڵی ئاشكرا كردنی زانیاریەكانی پشتی پەردەوە بدە وبەراوردی بكە لەگەڵ ئەو وەڵامانەی بەدەست دێت لە پاندۆڵەكـەوە.دەشـێ كە پاندۆڵەكـە كەرەسـتەیەكی هەڵمژینی سەرسـام بێـت، بـەڵام بـیرت بێتـەوە كـەئامێرێكی تایبـەت بەسـەرنجدان ئاسـتەكانی جیـاوازە لەهۆشیاریدا بەتەنها.... ئەنجا لەكاتێكدا ئاوەزی هۆشیاری وناوەوەت پێكەوە كاردەكات، ئـەوا تـۆ بـەتوانا دەبیت لەسەر بەكارهێنانی پاندۆڵ بەوەڵامی وەسـتاوت لەسـەر بناخـەی دەروونــی لـەكاتی پێـشنیاری هـەر پرسیارێكدا كە لەهۆشەوە هەڵكولابێت.

## نوسینی خود كارانە- Autolmaricwriting

نوسینی خودكارانــە (لـەناكاوی) هـەروەكو ئەوبارەیـە لەگـەڵ پاندۆڵەكـەدا هەیـە، هۆكارێكـە بۆگەیـشتن بەزانیاریەكان لەدەروونی ناوەوە بەبێ دەست تێوەردانی ئاوەزی هۆشیارانە.كەلەگـەڵ هـەموو پەرەگیریـەكانی (ڕێگاكانی خودكارانەدا) لەوێدا گەمارۆدانی بنەڕەتی هەیە كە لەگەڵ بڕیارەكاندا دەبێ لەبەرچاو بگیرێن.

وباوە كەئەم كەرەستانە گەوالەكان وهێزەكانی دەرەكی بڕیاری لەسەر دەدات... نموونەی ئەم بیروباوەڕە نابێ بڵاوببێتەوە لەبەر ئەوەی پشت بەراستی نابەستێ..بـەڵكو كەرەسـتەیەكی فـەرمان دانـی دەروونـی ناوەوەتـە بەوازهێنان لەدەستەڵات لەسەر سیستەمی دەماریت. كەلەوانەیە سەبارەت بوونەوەرانی تـر بێـت كەدەسـەڵاتی بەدەنی یان گیانی بەسەردا بگرن لەسەر ڕژێمی دەماری بۆ ئەو كەسانەی كەخۆیان توش دەكەن بۆ نواندنی ئـەم

جۆرە لەدەسەڵات. تائەوكاتەی ئەم ڕاست گۆییە سەركەوتوویێت و لەو كەسانەوە دەربچێت كەخاوەنی هیچ شارەزاییەك نین بەڵام پارچە مۆزیكایەك دەژەنن كە بۆ مۆسیكا ژەنە گەورەكان دەگەرێتەوە یان ئەو تابلۆیانە وێنە دەكێشن كەدەگەڕێتەوە بۆ وێنەكێشەرانی گەورە، كەزۆربەیان دیسان دەدرەوشێتەوە لەئاستەنگیەكی گەورەدا لەگەڵ شاراوەیی لەژیانی كەسی ( سەربـاردا ). لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێ لەدایك دەبێ وتێپەڕدەبێ بەكۆناخەكانی گەشەكردنی بێزاركەردا ئە نجا فێردەبێ بۆ ئەوەی ئامانجی تایبەت لەژانیدا بەدەست بهێنێ، كەوازهێنان لەوە بۆ بەرژەوەندی ئامانجەكانی كەسانی تره ئەمیش جۆرپێكە لەخۆكوژی.

هەروەها بەدەر لەهونەرمەندان و نوسەرانی گەورە، ئەوا بوونە وەرانی مشەخۆر بارەكە بەكاردەهێنن كاتێك كەسێك لەدەسەڵات بەسەردا شكانی دا واز دەهێنێ، زۆرجار لەجۆری خراپی نابێ وگرنگی پێدان پێوانە ناكەیت لەژیانی كۆمەڵایەتیماندا.جگەلەوەی كەبوونەوەرانی باڵاناشێ لەسەر ئەم پلەیەبن و لەنەبوونی پاكژی بن بەوەی دەست بەسەر كەسایەتیەكەتدا بگرن یان دەست بگرن بەسەر بوارێكی تایبەت پێت. سەرباری ئەوەش، ئەوا تۆ گرنگ نیت لەژیانی كۆمەڵایەتیاندا.یادی خۆت بهێنەوە كەسەربەستی وویستن یاسای سروشت دەنوێنێ، كە ئەگەر پێی دوور خرابنەوە پێی، ئەوا ئەوان ئەوەی ڕێك دەخرێ هەڵی دەگرن لەسەر ئەو تێكەڵی ودواكەوتنە لەكرداری كشەكردنیاندا. نەویستنی هاوشێوە بۆ نوسینی لەناكاو ( خوردكارانە ) دەژمێردرێ بەمانای ئەوەی كەدەبێ بۆ كردنەوە پەیوەندی باشتر لەگەڵ دەروونی ناوەكیتدا بەكتربهێنرێ. دەروونی ناوەكیت ئەوەیە كەزاڵ دەبێ بەسەر ڕژێمی دەمارتدا، كەبەوەشدا زاڵ دەبێ بەسەر كەرەستەی خودكاریدا كەبەكاری دەهێنی لەماوەی پێ هەستانتەوە،كە دەشێ بۆ دەروونی ناوەكیت، ڕێژەیەكی زۆر لەزانیاریەكان بۆت پەخش بكات.كەبەتوانینی پەیوەندی كردن بەئاوەزی كەسانی ترەوە دەردەكەوێ. بەڵكو هەتا لەگەڵ ئەو مردوانەشدا كە هەز وخۆشەویستیان دەگێرنەوە لەوەی بۆت دەگوێزنەوە، واتە بەزمانیان دەدوێن. كەئەوەیش تاكەكانی تایبەت بەخۆیان لەزۆربەی ئاخافتنەكانیاندا بەكار دەهێنن، ڕەنگە پەیوەندیەكانی خۆیان بن بەدارشتنەوەی شێوە پێوەگرتنەكان یان بیرەكانیانە بێن، كەلە پاشاندا بەهۆبەندی دەروونی ناوەكیتەوە بۆ ووشەكان لەبەریدا دەگێڕێتەوە.

بۆ كردەوەكانی ناویستی ناشێ كەدرێژەبدات بۆ دوای كاتی دیاری كراو بۆی لەكاتدا. بۆیە بانگی دەروونت مەكە ڕامالین بكات لەگەڵ پێ هەڵستاندا، كەبەوەشدا ماندوو دەبیت ودەسەڵات لەدەست دەدەیت.بیرۆكە بەئاوەزی هۆشیاریت مەدە بەوەی كەبەڕێوەبەرە....كەنەخۆشخانەكانی تایبەت بەنەخۆشیەكانی ئاوەزی پرە لەوكەسانەی كەدەستەڵاتیان لەسەر ژیانیان، بەئاوەزی ناوەوە پێ دراوە...كەبێجگەلەچاوەڕوانی لەسەرت نیە بۆ دەروونی ناوەوەت بڕوانی لەسەر ئەوەی كەسەركردەتە، كە ئەوەش دوای دانانی هێڵەكانی سەرۆكایەتی ڕوون وماوە دیاریكراوەكانە بۆ هەر دانیشتنێ. زۆرجار نوسینی خودكارانە تەواو دەبێ بە پێنوس، بەڵام ئەگەر شارەزاییت لەسەر ئامێری چاپ كردن هەبێ ، ئەوا دەتوانیت ئامێری چاپ كردن بەكار بهێنێ، كەئەویش دەبێ لەبەردەمیدا

دابنــشیت، کەبــەئاوەزت بگوێزرێیتــەوە بــۆ بــاری   نائاوەزی ( لــەش خاوبوونــەوەی تــەواو )، ئــە نجا دوای ماوەیەکی کورت تێبینی دەکەیت، کەهەردوو دەستت بەشێوەی لەناکاو دەنوسێ وچــاپ دەکــات.ئــەوەی دەســتت دەینوسێ مە یخوێنەرەوە تاوەکو بەتەواوی لەنوسین نەبیتەوە. هــەروەها خواســتت بــەدی هێنــانی ســەرکەوتن بێت، ئە نجا بۆ دەروونی ناوەوەت بابەتێك بۆ نوسین دەربارەی پێشنیار بکە یان پرسیارێك بکــە دەشــێ وەڵامــی بدرێتەوە. ووزەیەك بۆ دەستت بنێرە کەدەنوسیت بۆ فراوان بوون لەنوسینی سەرکاخەزدا. ئە نجا ئەگەر ئامێری چاپ کردنی بێت یان پێنووس بێت ڕێگری دەرچوون دەکات بۆ باری نائاوەزی، بەکارهێنانی تابلۆی بچکۆلە کــە تابلۆچکەی پێ دەگوترێ بەکەڵك دێت، کەدروست کراوە لە پارچەیەك لەتەختەی تەنك لەگــەڵ ســێ پارچــەی بچوکدا کەوەکو لاکانی بەکار دەهێنرێ و پارچە تەختەکە شێوەی سێ گۆشە وەردەگرێ. کەدەبێ یەکی لەلایەکانی سێ گۆشە پان بێت کەئامادەیی وەرگرتنی یان جێ بوونەوەی چوار پە نجەکە لەناودا هەبێت تا بــەئارامی پێــی بگات کەدەبێ دوولاکەی تربەیەك بگەن لەخاڵێکدا لەژێر کۆتایی لە پی دەستت ڕاستە وخۆ.دوای ئەوە هەستە بە ڕێکخستنی لایەکانی لەگۆشەکانیەوە کەدەبێ درێــژایی لــەنێو ئینجــەوە بــۆ ســێ لەســەر چــواری ئیــنج بێــت، کەلەدوایدا کرداری کون کردن فراوان دەبێ  بۆهەڵگرتنی پێنوس بەباری دانراو کەسەرەکەی جێ گیردەبێ لەسەر کاخەزە دانراوەکەی ژێریدا.

ئە نجا بەکارهێنانی تابلۆچکەکە ئاسان دەبێت و ، خۆت ئامادەبکە وەکو ئــەوەی لەســەرەوەدا  پێناســەی کــراوە لەنوسینی خودکارانەدا.

چاوەکانت دا بخە وخەیاڵ بکەوە کەتابلۆچکەکە دەجوڵێت بەناوکاخەزەکەدا ودەنوسیت لەژێر کارتێکردنی هێزی ڕژێمی دەماری لەناکاوتدا کەتابلۆچکەکە بە پێچکەی ڕاهێنان دەچێت  لە پاسکیلدا ( پاسکیلی سێ پێچکە )، واتە کەتۆ لەسەرەتادا  پێویستت پێی دەبێت بەلاّم دوای کاتێکی کورت لێ تێردەبیت....کەئەویش دیسان بەفێربوونی سواری  پاسکیل دەچێت، بەمانای ئەوەی دان بەخۆدا گرتنــی دەوێ....کەکارکــەری دان بــەخۆداگرتن لێــرەدا زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بتوانی ئاوەزی ناوەوەت لەبڕیارەکانی دەسەڵاتیدا بەسەر دەروونــی نــاوەکی هــەبێ ئــە نجا ئەگەر لەسەرەتاوە سەرکەوتن بەدەست نەهات، بێ ئومێد مەبە....کاربکە لەسەر دڵنیــا کردنــەوەی تواناکــەت لەسەر نووسینی خودکارانە...هەموو ڕۆژێ کاتیکی دیاری کراو دیــاری بکــە، واتــە ڕۆژانــە لــە هــەمان کاتــدا بەڕاهێنانەکە هەڵبستە ، هەروەها هیچ شتێ بانگ مەکە بەرهەڵست بێت لەگەڵ ئەم کاتەدا، کــەدیاری کردنــی ( ١٥ ) خولەك لەڕۆژێکدا   بەباش دادەنرێ.نیگەران مەبە کە نیگەرانی زۆرجار کەڵەکەبوون ڕێگری دەکات.

ڕاهێنانی ژمارە -١- لەنوسینی خودکارانەدا —تاکیدا

کاتێکی پانزدە خولەکی دیاری بکە ودانیشە لەبەردەم ئامێری چاپ کردندا یان پەراوێك لەبــەردەمت دا دابنــێ و پێنووسەکە بەشلی لەدەستت بگرە.کاربکە لەسەر پاکژکردنەوەی هۆشتت، دوای ئەوە شتێك بڵێ وەکو: هەزدەکەم هەندێ زانیاری بەدەست بهێنم لەئاخای-B -وە ) دوای  ئەوە بەئارامی دابنیشە و چاوەڕێ بکە...ئە نجا کاتێــك

خۆپارێز دەمێنیتەوە لەسەر باری نائاوەزی بۆ چەند  خولەکێك، ئەوا سەرسام دەبیت کاتێ دەستت دەبینیت چاپ دەکات، یان وەڵام بۆ دواواکەت دەنوسێتەوە. خواستی زانیاریەکان یارمەتیت دەدات لەسەر سەرنجدانی ئاوەزی ناوەوە. هەوڵ مەدە ئەوەی نوسیوتە بیخوێنیتەوە هەتا دەستت لەنوسین دەوەستێ. دوایی ئەوەی نوسیوتە بیخوێنەرەوە وتێبینی بکە کەچۆن پەیوەندی هەیە بەخواستی بنەرەتیتەوە. هەندێ کەس بەشێوەیەکی سروشتی نوسینی خودکارانە بەدەست دەهێنن. کەسەرکەوتنێکی سەرسام بەدەست لەیەکەم کەرەتەوە دەهێنن. هەروەها هەندێکی تر دەبینین کەخۆیان پێویستیان بەکاتێکی درێژترهەیە بۆ ئەوەی شارەزاییەکانیان پەرە پێ بدەن کەزۆرجار ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگیری کردنی هۆش لەڕێگە پێدانی هەر دوودەست بۆ کارکردن بەسەر بەخۆی لەدەروونەوە.

## هونەری خودکاری Automatic Art

هونەری خودکاری لەنوسینی خودکاری دەچێت بەدەرلەوەی کەئاوەزی ناوەوە بەدەربڕینە- کانی هونەری ناتێگەیشتووەوە دەردەچێت، کەئەویش لەجیاتی نوسین بەکار هێنانی لەنوسینی خودکارانەدا کەمترە. کەسەبارەت بەکەرەستەکان، ئەوا تۆ لێرەدا پێویستت بەوەیە هەروەکو چۆن هونەرمەند پێویستی بەئامادەکاریەکان هەیە بۆ بەرهەم هێنانی شێوەی هونەری دیاری کراو، وەکو پێنوسەکان وڕەنگەکانی ئاوی زەیتونی وفلچە وکاخەزیان تابلۆیەك واتە هەموو ئەوەی وێنەکێشان لەئامادەکاری وکەرەستەکان دەیخوازێ. هەموو ئامادە کاریەکان لەسەر مێزێك دابنێ کە لەسەری دادەنیشیت ئەنجا ئەرکە کەکاخەزەکەت یان تابلۆکەت بەشێوەیەکی ڕووکەش کراو لەسەر مێزەکە لەگەڵ ژمارەی ڕەنگەکانت لەبەر دەستتدا درێژبکەیت. فلچەکە بەرزبکەرەوە ڕووەکەی بەهێواشی بەرە وکاخەزەکە بەرە. چاوەروان بکە هەتا باڵت دەجوڵی لەو ئاراستەیەی کەئارەزووی تیادەکەیت واتە بەرە وهەر ئامادە بوویەك لەسەر مێزەکە کەهەزت لەبەکارهێنانیەتی. بانگهێشتی باڵت بکە بجوڵێ بەڕەهایی وچاوەڕێ بکە بۆ ماوەیەك لەڕێگەیەوە ڕێگە بەدەروونی ناوەکیت بدەیت وەڵامی داواکەت بداتەوە. لەسەرەتادا دەبێ ئامانجەکە دیاری کراوبێت .وەکو ئەوەی خواستێ بێت بۆ وێنەی ئاژەڵێك یان گوڵێك، کەبەوەشدا لەسەر دەروونی ناوەوەتە تەنها درێژەکاری بدات. کەهەزدەکات لەمانەوەی چاوەکانت بەکراوەیی بۆ دڵنیابوونەوە کەکارەکە تەواو دەبێ لەسەر کاخەز نەك لەسەر مێزەکە کەئەوەش لەباری لادانی کاخەزەکەدەبێ...

**ئه نجا كاتێك كارەكه لەیەكەم كاخەزدا كۆتایی دێت دەستت بەتەواوی بجوڵێنه بۆ دەركردنی لاپەرە تازەكە. لەباری خاوبوونەوەدا بانگی دەروونی ناوەكیت بكه بۆ ئەوەی وەڵامێك دەربارەی خۆت بۆ ئارەزووەكەت دەربڕێ ئه نجا نابێ فەرمان لەسەر نوسینی خودكارانه بدرێ هەتا پێی هەڵدەستێ.**

**تابلۆی ئویجا-** THE OUIGA BORD

**بەراستی زۆربەی خەڵكی تابلۆی ئۆیجایان بیستووه كەبریتیه له ( گەمەیەك ) داهێنراو تیابەكاردەهێنرێ بۆ باربوو كردن بەووشەكان وزانیاریەكان بەكەرەستەكانی نائاسایی یەوە. لەتواناتدایه كەدانەیەك بكڕێت یان بەخۆت دروستی بكەیت.**

**باشترە پارچەیەك لەتەختەی فاییەر دابنێیت یان تەختەیەكی تەنك لەسەر ڕوویەك بێت بەشێوەی جێگیر... پاشان پیتەكان وژمارەیەك هەتا ژمارە ( ٩ ) لەسەریان بلكێنه لەگەڵ هەردوو ووشەی بەڵێ ونەخێر لەسەر شێوەی بازنەیەك بەچوارلای تابلۆكەدا. دەتوانی چەسپ لەجێگیر كردنیدا. بەكار بهێنیت یان خۆت هەموو كەرەتێ بەدەست پێیدا بلكێنی، واته وەكو ئەوەی لەگەڵ كاخەزەكانی یاری كردن ( گەمەكردن )ئه نجامی دەدەیت.....ئه نجا هەمیشه پارێزگاری بكه لەسەر سادەیی وئاسانی، ئه نجا كاتێك تابلۆچكەكەت ئامادەیه بەهەڵگەڕاوەیی ڕاگرە كونكەرەكه ( مەكارە )لەناوەڕاستیدا دابنێ. پاشان دووكەسەكه یەكیان بەرانبەر ئەوی تریان دادەنیشێ بەجۆرێك سەری په نجەكانیان جێگیربێت بەهێمنی لەلوتكەی تابلۆچكەكەدا. ئه نجا له كاتی كردنی پرسیارەكەدا خێرا دەبینی تابلۆچكەكه دەجوڵێ بۆ زنجیرەیەك له پیت وژمارەكان، تابلۆچكەكه بەهۆی ڕژێمی دەماری هەردوو كەسەكەوە كه دەستیان لێ داوە دەجوڵێ. زۆرجار گرتنی دەروونی ناوەوە بەهێزترەو بەدەستەوە گرتنی دەست پێشخەری لەنێوانیاندا دەمێنێتەوە و ئەوی تریان ووزە ڕەت دەكات. كەلە نموونەی ئەم بارەدا پێ دانی وەڵامەكان بەڕوونی یەو خێراتر دەبێ. هەروەها لەباری ململانێی دووكەسدا بۆ وەرگرتنی دەسەڵات فەرمانەكه تەنها تیك چرژان دەبێ.**

**هەروەها لەكاتی پرسیاركردنی له پردا بەوەڵام دانەوەی له پڕدەگەیت. پرسیارە نادروستەكانی لێیەوە پێی دەگەیەت دیسان وەڵام دانەوەشی ناردوستە. كه پرسیارەكان نەگونجاون وەڵامەكانیش نەگونجاون هەروەها پرسیاری ناژیرانه وەڵامی بێ مانات لێیەوە پێ دەگات.لەدەست پێكدا زۆربەی وەڵامەكان شێواون.ئه نجا ئەگەر لەوێدا پێویستی پەیوەندی كردن بەشتێكەوە هەبێ، ئەوا دەروونی ناوەوەت كەرەستەیەك دەدۆزیتەوە جالەگەڵ تابلۆچكەكەدابێت یان بەبێ تابلۆچكەكه. ئه نجا ئەگەر لەوێ پێویستیەك نەبوو بۆ پەیوەندی كردن بەشتێكی تاییەتەوە، كەتەنها ئەویش یاریەكی كات بەسەر بردن دەردەكەوێ. كەلەتوانای دەروونی ناوەوەدایه كەچەند چیرۆكێكی جوان دابنێ بۆت تەرخانت بكات وپێشڕەوی و چاوەڕوانیەكانت دا بمركێنێ ووات لێ بكات كەبیربكەیتەوە چیرۆكێكی ڕاستینەیە.**

## Table Tipping لیدان لەمێز

کوتان ولێدان و تە پەتەپ کردن لەمێز زۆرتر کارتیکراوە لەوانی تر لەکەرەستەکانی خودکاری کەلەسەرەوە ئاماژەی پێ کراوە، کەئەوەش بەئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێژەیەکی ووزە کە پێی بەراوورد دەکرێ. ڕوونەکە لەتوانای هیچ تاکیکدا نیيە کەفێڵ بکات یان ( هەڵس وکەوتی تاك پاك بکات ) بۆ ئەوەی کارەکەی بکات.

چوار هاوڕێ کۆبکەرەوە بەدەوری مێزێکدا کە بەهەر گەواڵەیەك بێت واتە هەرکەسە وجێگەی تەواوی هەبێ بەدەوری مێزەکەدا....لەسەر هەموو بەشداربوویەك کەبگوێزرێتەوە بۆ باری نائاوەز واتە باریکی دەرچوو لەهۆشێکی پاکەوە، لەگەڵ مانەوەی سەری پە نجەکان لەدانانیکی جێگیردا لە نزیك لێواری مێزەکەوە، پاشان بەئارامی چاوەروان دەکەیت لەگەڵ چاوەدێری کردنی ووزەیەك کەلەدەستەکانەوە گوزەر دەکات بۆ ناو مێزە تەختەکە بۆ دروست کردنی باریك کەلەچوار چێوەیدا بجوڵێت. کەهەموو دانیشتنێك بەهەزە دەست پێ دەکەیت بەڕاهێنانی بەرگری کردن کەبەشێوەی کارتیکراووودروست بێت چونکە ئەم جۆرە لەکار هەوڵ وگرنگی گەورەی دەوێت.

دەبێ ئاما نجەکەت پێش دەست پێکردنی دانیشتنەکە بەماوەیەك لەکات دیاری کرابێت. زۆرجار خەڵکی ئەم شێوازە لە پەیوەندی کردن بەبوونەوەرانی کۆچ کردووە بەکار دەهێنێ وەك ئەوانەی بەدەنیان مردووە.دەبێ یەکێ لەبوونەوەرەکان دیاری بکرێ و پەیوەندی پێوە بکرێ کەتیایدایە پێناسەیەکی ناهەز لێ کراو دەگەیت کە بۆت دەبێتە هۆی ئاستەنگی.ئەگەر داکۆکیت کرد بەشێوەیەکی لەسەر سور بوو بۆ هەندێك لەزانیاری لەکەسیکی دیاری کراوەوە، ئەوا لەو کەسە داوابکە پەیوەندیت پێوە بکات ووەڵامی پرسیارەکانی بدەیتەوە.بەراستی پێویستی ڕاستینە بۆ مرۆڤ دەشێ کە دەرکەوتەیەکی دەروونی پێ ڕووبدات کە بەهێزێك بێت پتر لەهەر شتێکی تر. زۆرجار پەیوەندیەکان گەمارۆ دەدرێ بە پرسیارەکان کەوەڵامەکەی بەبەڵێ یان نەخێر کورت کراوەتەوە. دڵنیابە لەدەنگە هێماکەت ( جفرەکە ) پێش ئەوەی دەست پێ بکەیت، نمونەش لەسەر ئەوە کەلەمێزدانێك ( تە پەیەك ) مانای بەڵێیەو دوولەمێزدان( دووتە پە ) مانای نەخێرە کە پێویست دەبێ بۆ بەسەر بردنی دانیشتنێکی بچکۆلە کەتێیدا ووزە کەڵەکە بووەکانت بەکار دەهێنرێ بۆ ئەوەی والەمێزەکە بکات تەکان بدات بۆ سەرەوە بۆ خوارەوە، بێگومان دەرکەوتەیەکی ووروژێنەرە. کەدەچێتە چوارچێوەی دەرکەوتەی جوڵاندنی شتەکان لەدوورەوە کەلەکەرتی داهاتوودا لەم پەرتووکەدا دێینەسەری.

## Dowsing -دەوسەرە –پەلکێش

دەوسەرە یان پەلکێش کەرەستیەیەکە لەدەستتدا بەکار دێت درێژە بوونەوەیەك پێك دەهێنێ بۆ سیستەمی دەماریت کەباربووت دەکات بەزانیاریەکان لەکێڵگەکانی ووزەی دەوروبەرتەوە....کەبۆ هەر شتێك کایەی ڕووناکی خۆی هەیە کە پێی جیادەبێتەوە. بەراستی بەشەکانی نازیندوو بۆ هەمان مادە بەگشتی جیاوازە لە پلەی

تەكانيـدا وچـەنديتى وتوانـاى لەسـەر جولأنـدن.   كەرِەنگە بەدەنمان ناوەرۆكى  پيك بێـت لەهـەموو ئـەو مادانەى كەلەسەر زەوى هەيە، كەدەروونى ناوەوەمان پێى لەسەر زانيارى دانى فراوانـە....هـەروەها دەروونـى ناوەوە ديسان دەزانێ بەدەنى چى لێ كەمەو چى لێ زۆرە.هەروەها پێويستى ڕاسـتينە ڕەگـەزێكى سـەرەكى پێـك دەهێنێ لەدەركەوتەكانى دەروونىدا كاتێك كەسێك لە پەلكێشەكان دادەنرێ ئەوانەى سـەركەوتنيان بەدەسـت هێناوە، لەتاكيكردنەوەكانى بەريتانيادا  شكستيان هێنا كەئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ديـار نـەمان و ئـاوابوونى پێويستى ڕاستينە.بەڵكو هەموو ئەوەى كەهەيە ئـەويش چـاكەى زانـستى وچـاوەدێريە، بـەلأم ئەگـەر لـەوێ پێويستيەكى ڕاستينە خواستراوى تێر بوون بێت، كەدەروونى ناوەوە كارەكەى وەكو ئاسايى پێـك دەهێنـێ.ئـەوا دەبێ دەروونى ناوەوەت بەرێزەوە هەڵس وكەوت بكات،  ئە نجا ئەگەر هـەڵس وكـەوتى كـرد لەسـەر ڕوويـەكى پەيام بدا بەوەى كەدەروونى ناوەوەت ڕێزناگرێت، ئەوا ڕاست دەكەيت و وەلأم دانەوەى بۆت دەبێت وبەندە لەسەر ئەو دەربڕينانە.  پێ هەڵستانى هيچ ڕاهێنانێك نابێ پەيوەست بێـت بـە سـوك كردنـەوەى هـەر شـارەزاييەكى دەروونىيەوە.  پەلكێشى مێژوويەكى دێرينى هەيە. هەندێ خەڵك بـاوەڕى وايـە كـە( خاچـى ژيـان ) ئەوانـەى كەفێرئەونيەكان لەميسرى كۆن هەڵيان دەگرت ئەوا ئەوەش كەرەستەى پەلكێشيە.بەراستى ئاشـكراكردنى ئـاو بە پەلكێشى لەسەر ئاستى جيهان ناسراوە ، كەزۆرجار بەهۆبەندى لكەدارێكى سەوزەوە لەسەر شێوەى پيتى واى ( Y )واى ) لەدرەختى فندكى ( بەندك ) ناسراو لەكەلە پورى ڕۆشنبيرى وفەرهـەنگى ئـەوروپادا ئەبردرێتـەوە. جوتيارەكان ئەم جۆرە كەرەستەيە لە پيتى ( Y ) بەكاردەهێنن بۆ ئاشكراكردنى  ئاو بۆ ئاودانى خێزانەكانيان وئاژەڵەكانيان. هەروەها  پەلكێشى كردن لەچين بەكار دەهێنرێ بۆ بڕياردان لەجێگەى تـازە بـۆ دامەزرانـدنى كارگەو خوێندنگە لێى لەگەڵ ئەوانى تـر لەبەكارهێنانـە تايبەتـەكانى كـەكاركردن پێـى دەگەڕێتـەوە بـۆ چاخەكۆنەكان.

ئـەمرۆ لەزۆربـەى وولأت دا يەكێـــى دەوسـەرەكان ( پەلكێـشەكان ) هەيـە...كـەمن ئەنـداميكم لەيـەكێتى پەلكێشەكانى ئەمريكا، كەسالأنە دانيشتن دەبەسترێ و زۆربەى  پەلكێشەوانيەكان لەئەمريكا ئامـادەى دەبـن كەئەوانيش دەست پێ پێشوازى دەست پيكەران دەكەن ئە نجا ئەگەر گرنگى دەربيت ئەوا لەتوانادايە ڕێكخستنى ئامادە بوونەكەت بۆ وانەكانى تايبەت بەدەست پێ كـەران بێـت. كەلەتوانادايـە گـويگرتن بـۆ ئـەو چـيرۆكە وروژێنەرانە بێت كەڕا پۆرتەكان لەتوێژينەوەى زانستى لەدەوسەرەدا بێت.

ديسان لەتواناتدايە بۆ داواكردنى زۆرتر لەزانياريەكان  لەدەوسەردەمە يان بۆ بنوسيت. كە پاندۆل سـەبارەت بەمن بە باشترين كەرەستەى دەوسەرە دەژمێردرێ. كە لە بەديهێنانى زۆر لەئاما نجەكا نمدا بەكارى دەهێنم كـە لەماوەى پانۆلەوە، دەروونى  ناوەوەم هەواڵم پێ دەدات دەربارەى پێويستيەكانى بـەدەنم بـۆ ڤيتامينـەكان و كانزاكان، كەئەوەش بارى بـەدەنيم وئـەوانى ترلـە پێويـستيەكانە...هـەروەها كەديـسان هـەواڵم دەداتـێ بەدووراييى  وەلأم دانەوەى دەروونى ناوەكى بۆ ئەو نەخشەو پرۆژانەى كەسورم لەسەرى پێـى هەڵبـستم.لەبـەر

ئەوەی بەبێ یاریدەرو یارمەتی ناتوانم زۆرتر بەدەست بهێنم- کەئەویش دیسان هەواڵم دەداتێ بەهەستەکانی کەسانی تر وخولیایان وباری تەندروستیان و زۆر لەشتەکانی تریش. کەچۆنیەتی بەکارهێنانی پاندۆڵم شیکردۆتەوە کەبە درێژی لە پەرتوکی وێنە کێشراودا( huna ) هاتووە ( کەئەویش توێژینەوەیە لە پاراسایکۆلۆجی لەساڵی ١٩٧٦ بڵاوکرایەوە). کەلەوێدا دیسان پەرتوکە جۆراو جۆرە باشەکان دەربارەی بەکارهێنانی پاندۆڵ بۆ مەبەستەکانی نائاسایی هەیە .کە کریستۆفەر هلز لە پەرتوکەکەیدا نوسیویەتی بەناوی ( unclear evolution and supersemnsonics ) لەگەڵ پەرتوکی ( the pendulum and possession ) هی دانەر ولیەم فنگە هەروەها لەچاپدراوی تاییەت هەیە کە لەیەکیتی دەوسەرەکانەوە دەرچووە. دەتوانرێ کەرەستەکانی تر بەکار بهێنرێ لە پێ هەستان بەکرداری پەلکێشی ( دەوسەرە)دا. کەئەو کەرەستەکانەی زۆر تر باون سێ دانەن کەئەویش دارێکە کەشێوەی پیتی( y ) هەیە لەگەڵ دارێك کەشێوەی پیتی ئیل ( L )هەیە لەگەڵ داری سەنارەدا ( Bobber ) کەداری (( Y )) وەردەگیرێ شێوەی درکی هەیە وناوی داری جادووی پێ دەگوترێ.... کەزۆربەی دەوسەرەکان ( پەلکێشەکان ) داری میوەن کە دەشێ کارەکە بەشێوەی باشتر پێك بهێنێ، کەلەوێ دا داری سنەوبەر وبندق باشترینیانە ئە نجا دارەکە هەر چۆنێ بێ دەبێ سەوز بێت و لەگەڵ دەست پێکردنی کرداری دەوسەرەدا دارە بەسەوزی دەبڕدرێتەوە واتە لەگەڵ هەرکردارێکی پەلکێشی دا دەبێ لکە دارەکە سەوز بێت وتازە ببڕدرێت. هەرچەندە کەبڕینی داری نوێ لەگەڵ کرداری پەلکێشیدا بەکاری گران دەژمێردرێ لەهەندی شتیدا، کەزۆربەی پەلکێشەوانەکان بەبەندێکی نایلونی یەکێ لە دوو سەرەکەی توند دەکەن پاشان کۆتاییەکەی تری لەدەستیاندا بۆ پێك هێنانی شێوەی درك واز لێ دەهێنن.کەلەوێدا باوەڕدەکرێ کەبەکارهێنانی هەرکەرەستەیەك ئاسایی بێت و ناشێ کەئە نجامی نوێ بدات، بۆیە ئەوانیش بەکار هێنانی دارەکە لەئەلەمنیوم دروست کرابێ بەباشتر دەزانن دوای ئەوەی دەی چەمێنەوە لەسەر شێوەی پیتی (( U )) هەروەها شێوەی داری (( Y )) یان مادەی دروست کراو لێی هەرچۆنێ بێت دەبێ کۆتاییەکەی بەهەردوو دەست بگیریت کەدەبێ ئاراستەی لە پی دەستت بۆ سەرەوە بێت هەروەها دەبێئاراستەی لوتکەی داری (( Y )) ڕوولەسەرەوەبێت. ئە نجا کاتێ پەلکێشەوان کە داری (( Y )) پەلکێشی دەکات، بەناو هەندێ لە کەرەستەی خواستراودا ئەوا لەئاوەزی ناوەوەدا شوێنەکەی دیاری دەکرێت، کەلوتکەی دارەکە ڕادەکێشێ و ورووو دەکاتە خوارەوە.

دەشێ دارەکە لەسەر شێوەی پیتی (( L )) دروست کرابێ لەسەر شێوەی سەری گۆڤان .بەدەست هەردوو دارەکە بگرە بۆسەرەوە کەلەسەریەکتری تەریب بن..ئە نجا کاتێ بە ئاما نجەکەتدا تێپەردەبێ، ئەوا هەر دووکیان دەجوڵێن گرنگ نیە پێکەوە یان بەئاراستەی یەکتری یان بەجیا لەیەکتری بجوڵێن ...بەلاّم کاتێك هەردووکیان وەستاون بەئاراستەی ڕۆیشتنت ،لەوکاتەدا تۆ ڕاستەو خۆلەسەر ئاما نجەکە دەبیت بەلاّم داری سەنارە کەبریتی یە لەلکیکی ڕەش بەدرێژی دوو پێ یان سێ پێ لەگەڵ تەنیکی شێوە گۆیی بەکۆتاییەکەیەوە دەلکێنرێ. سەنارەکە

بگره بۆ سەرەوە و بەهێواشی برۆ، بەمەرجێ پارێزەر بمێنیتەوە لەسەر سەنارەکە بەبارێکی جێگیر. ئـە نجا کاتێك لەئاما نجەکەت نزیك دەبیتەوە ئەوا سەنارەکە ڕوو دەکاتە ئاما نجەکەت.لەتواناتدایە دەروونی ناوەوەت ڕابهێنی لەسەر پەیوەندی کردن بەناوکەرەستەکانی پەلکێشی ئاماژە بۆ کراوی سـەرەوەدا کەئـەوەش لـەماوەی دیاری کردنی ئاما نجی ڕوونەوە دەبێت وەکو ئەوەی پەرداخێ ئاو دانرابێ لەسـەر زەوی,ئـە نجا لەکاتێکـدا تـۆ بەدارەکەدا بەسەریدا دەڕۆیت، هەڵبستە بەهەموارکردنێکی ئاسان بۆ دەسـتت تالەگـەڵ دارەکـەدا بجـوڵێ.بـۆ دەروونی ناوەوەت بدوێوهەواڵی پێ بدەبەوەی لێیت دەوێت، ئە نجا ئەگەر ئاماژەیەکت بۆ ئـاو بەدەسـت هێنــاو پەیوەست نەبێ، بەئاوی هـەبوو لە پەرداخەکـەدا، ئـەوا لەتوانتدایـە شـوێنەکە بپـشکنی بـۆ دڵنیابوونـەوە لەنەبوونی ئاوی لوولەکێشی لەژێر ئەردەکەدا کەلـەوێ دا ئـاوی ژێـر زەوی هەیـە....ئـەوا پێویـستی بـەهیچ ڕاهێنـانێك نی یە بۆ ڕاکێشانی ئەو شتانە بۆسەرەوە.

دیسان دەتوانیت بۆ مەبەسـتەکانی پەلکێـشی نەخـشەبەکار بهێنـی. پێنووسـیکی ڕەشـوکی لەدەسـتت بگـرە ولەدەستەکەی تـریشت ئاراستەگر ( پاندۆڵ ) هەبێت. لەدەروونی نـاوەوەت داوابکـە کەهەڵبـستی بەجوڵانـدنی پاندۆڵ بە پێچەوانەی ئاراستەگری کاتژمێر بەدرێژایی ڕۆیشتنت بەرەو ئاما نجەکەت.کەبەڕاسـتی جوڵانـدنی پاندۆڵەکـە بە پێـچەوانەی جوڵـەی ئاراسـتەگری کاتـژمێرە دەبـێ کاتـێ دووربکەویتـەوە لەئاما نجەکـەت، بەبەکارهێنانی پێنووسی ڕەشۆکی دەست پێ بکە لەبەشی سەرەوەی لای چە پی لا پەڕەکـە پاشـان ڕووبکـەرە لای ڕاست، ئە نجا ئەگەر هەستت کرد بەوەی کە پاندۆڵەکە بەجوڵەی هێواش دەڕوات، جوڵەی پێنووسەکە والی بکـە هیواش بێت وهەروەها نیشانەی ( X ) دابنێ وبەم جوڵەیە درێژەبدە بەسەر کاخەزدا لەچە پەوە بۆڕاست لەگـەڵ دانانی ( X ) کەلەهەر کەرەتێکدا ئاراستەکەی تیادا دەگۆڕێت. دوای ئەوە کـرداری بڕینـەوە دووبـارە بکـەرەوە لەسەرەوەی لا پەڕەکەوە تاخوارەوەی لەیەکەم گوزەری دا لەلێواری چە پەوە تا دوای گوزەری لـەلێواری راسـتیدا. هەروەها لەکۆتایدا نموونەی ( × ) بپشکنە، واتە ئەو هیلکاریەی کەکێشراوە لەدانانی نیشانەی ( X ) کەئەوەش بۆزانینی پێگەی ئاما نجەکەیە.دەشێ بەکارهێنانی پەلکێشی دیسان لەگەڕان دا لەکەسانی بزربوودا بەکاربهێنی یان لەشتی بزربوودا هەروەها دەتوانی لەدیاری کردنـی شـوێنی بۆریەکانـدا بـەکاری بهێنـی یـان سـیمەکانی کارەبایی شاراوەدا کەچوارلای ماڵەکەتی داوە، پاشان دوای ئەوەی دەڕۆن بۆ شوێنی ڕاستینەی بۆ دڵنیابوونـەوە لەوەی پێ دەگەیت کە دیاری کردنی ئاما نجەکەیە بەووردی.کە پەلکێشیەوان هێنری کرۆس ناوبـانگی دەرکـرد بەئاشکراکردنی شوێنەکانی نەوت وئاو لەتەکساسدا بەبێ ئـەوەی ماڵەکـەی بـەجێ بهێڵـێ لەهـەرێمی میـان لەئەمریکادا.

# پەیبردنەکانی دەروونی لەدۆزەکانی گیانەوانیدا

دۆزەکانی گیانەوانی خوێندنەوەی دەست وخوێندنەوەی کاخەزی یاری و ئەستێرەگرتنەوە وخوێندنـەوەی گـۆی کریـستاڵی دەگرێتـەوە، کـەزانینی ئاینـدە لەڕێگـەی ئـای چـنگەوەیە، لەگـەڵ خوێندنـەوەی گـەڵاکانی چایدا....هەموو ئەم هونەرانە هەڵدەستێ لەسەر بنچینەی پێ هەستانی بابەتییـە کـە ئـەویش بەگێرانـەوەی سواریەك کەسەرداری دەکات بۆ کردارەکانی دەروونی خۆیی هەروەکو ئەوبارەی کەلەهەموو پـێ هەڵـستانەکاندا شیمان کردۆتەوە لەم پەرتوکەدا کەمەرجی یەکەم لە پێ هەڵستانی ئەم هونەرەدا لەش خاوبوونەوەیە وهیـواش کردنەوەی کرداری بیرکردنەوەکەیە لەگەڵ شیکردنەوەیەك کە نیوەگۆی چە پی مێشك پێی هەڵدەستێ، هەروەها دیسان هێورکردنەوەی بارەکانی سۆزداریە، بۆ بەرزکردنـەوەی نیوەگـۆی ڕاسـت لەمێـشك دەبـێ کـەدەت خاتـە باریپەیبردنی دەروونیەوە.

کەخوێندنەوەی لە پی دەست، بۆ نموونە، لەدەست خوێنەر دەخوازێ کەدەستی کەسی وویستراو بگرێـت و دەسـتی بخوێنیتەوە بەئارامی وبەبێ بیرکردنەوە لەوەی کە پێی هەڵدەستی، کەئەمەش ڕێگە بەچوونە ناوەوە دەدات بۆ دەروونی کەسەکە کەبەوەشدا خوێننەوەی گونجاو بۆ دەروونەکەی دەردەکوێ، کەلەو کاتەدا ووشەکانی کەدەسـت خوێنەر پێی دەدوێ بەرانبەرە لەگەڵ ئەوەی دەسورێتەوە لەهۆشی کەسی وویستراوی دەست خوێنەرەوەدا. هەروەها لەکاتی خوێندنەوەی کاخەزی یاریدا، کەلەسەرەتادا بڵاوبوونەوەی کاخەز دەپشکنرێ کەبەبێ هـیچ پاڵنـەرێك یان هەستێکی کەسی، ڕێگەی ڕاکێـشانی ڕوخـساری سـەرەکی دەدات بۆچـاو. کـەلێرەدا دەیخەینـە بەردەسـت کەبەشتێك لەدرێژەکاری دوو جۆرەکەیە لەو هونەرانەدا کەئەویش هونەری ( ئای چـنیگ ) لەگـەڵ خوێندنـەوەی گۆی کریستالیە.

## ئای جنیگ – I CHING

ئای چینگ کەچینیەکان دەی بێژن بـە ( یـی چـینگ ) هەروەهائەمەریکیـەکانیش پـێی دەڵـێن ( ئـای جیـنگ ) بە پەرتوکێکی زۆر کۆن دەژمێردرێ کەلە پەندوەرگرتن وزانین پێك هاتووە لای چینیەکان....کەمانای ( پەرتووکی لێکدانەوە ) دەگەیەنێ کەهەڵس وکەوتی لەگەڵ گۆڕانی نواندنی دەستەڵاتدا لەهەرباریکی ژیاندا پێ دەکـرێ ، پیشەکیەکی ئامۆژگاریە لەگەڵ چۆنیەتی وەرگرتن پێی لەچوارچێوەی باشترین ڕێبازدا.کەباشترین وەرگـێردراو سەبارەت بەمن ئەو وەرگێردراوەیە کەزانکۆی برنستۆن بڵاوی کردەوە...کەلێیەوە وەرگێردراوە بۆ ئەلمانی لەلایەن زانەر وزانیاری دەری گەورەوە ڕیچارد ولیەم کەدوای ئەوە بۆ ئینگلیزی وەرگێراوە لەئەڵمانیەوە کەکاری.ف. بایتز وەری گێراوە کە لەوێندەری لەڕاستیدا ژمارەیەك لەوەرگێردراوەکان هەن لەوانەش ئەو دووبارەکراوانەن بۆ ( جۆن بولفلد ) لەگەڵ ئەوی تردا کەهی ( ئار.جی.سو ) وە. هەروەها پشت ئەستور بە پەندولێزانیەك کە پەرتوکی ئـای

جیــنگ پــێی هەڵدەســتێ کــەرباریك پێــك دێــنێ  لە نموونە جیاوازەکان بــۆ دوو جــۆری بنــەڕەتی لــەووزە کەئەوانیش ( یانگ yang لەگەڵ ین yin )نە.

کەیانگ لەبنەڕەتەوە جیادەکرێتەوە بەوەی کەداهێنەرو باش ومتمانە پێ کراوە، بــەڵام ( یــن ) جیادەکرێتــەوە بەخرا پیەتی وبەخولیایەکی هەڵگەراوەیی.ئە نجا بە پێی ئەو هێمایەی کەلەئای جیــنگ دا هــاتووە، کــەیانگ لەهێڵێکی ئاسۆیی ناجێگیردا دەنوێنرێ بەڵام ( ین ) بەهێڵی ئاسۆیی پچڕپچڕ دەنوێنرێ.کەنواندنە بنەڕەتیەکان بۆ ئای جینگ دەگریتەوە لەسەر کۆمەڵەکانی کە پیك دێت لەشەش هێڵ و پێی دەگوترێ kuaکەبە گوا-gwa -لای چینیەکان دەبێژرێ کەزۆرجار وەردەگێردرێ بۆ شێوەی شەش لایی لە ئینگلیزی دا کەلەوێدا شەست وچــوار نــوێنراوی هەیــە. لەوێــدا وێنەبەرداریــەکی کــۆن هەیــە ولێکدانــەوەی نزیــك دەبێتــەوە بەهەریــەکێ لەوانەوە.کەتێزەکەی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ڕوون دەکاتەوە لەسەر بارەجیاوازەکانی، لەگەڵ شەش کۆناخی پەرەسەندن وجیاوازیەکانی کەدەشێ لەهەر کۆناخێکدا دەربکەوێ...کەئەویش هەڵبژاردنە جۆراو جۆرەکان وێنە بەرداری دەکات کە لەسەری بەدەستی دەهێنین لەهەموو کۆناخیکدا و لەبازنەی پەرەسەندنی ئای چینگ دانــراوە کەهەمیشە ئاماژە دەکات بۆ هەڵبژاردنی زۆرتری زانــین و پەنــد. کەخواســتی بــەکارهێنانی ئــای جیــنگ وەکــو پەیامێکە، دەبێ لەبەکارهێنانی پارەدا بێت یان داری یارۆدا بێت .کەیارۆ جۆرێکە لەڕووەکە لەهەموو جیهانــدا سەوز دەبێت، کەچینیەکان باوەریان پێ هێناوە کەئەم ڕووەکە پەیوەندی بە جۆگەکانی گــۆرانی بــاوەوە هەیــە لەجیهاندا، کەهەمان شت دەسە پێ بەسەر پارەکانزاییەکاندا، دەبێ ئەو پارانەبێت کەزۆرتر بەکار دەهێنــرێ لەجیهاندا وەکو پارەی ( ووردەی کانزایی ) کە پێویست نی یە پــارەی چــینی کــونکراو لــە ناوەڕاســتدا بەدەست بهێنرێ. پشت ئەستور بەڕژێمی ژمارەیی لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی بێت .کە ژمارە تاکەکان مانای یانگ یــان نێرە لەبەر ئەوەی ناشێ دابەش بکرێ بۆ دووان یان دوو بەشی یەکسان، کەژمارە جوتەکان( ین ) یان مێیە لەبەر ئەوەی لەتوانادایە دابەشبکرێ بۆ دووبەشی یەکــسان کەخواســتی ئامــاژە پــێ کردنــی پــەیام لەســەر ڕێگــای بەکارهێنانی پارەکانی جۆری بەهای ( ٣ ) بۆ سەرەکانە وبەهای ( ٢ ) بۆ کلکەکانــە. ســێ ســەنت لــە پارەی دۆلار لەدەستت بگرە و بەری بدەوە بەسەر مێزێکدا یان بە سەرزەویدا بەهای سێ سەنتەکە کۆبکەرەوە کەئەمەش بەهای هێڵی خوارەوە دەنوێنێ بۆ شێوەی شەش لای، کەئەگەر ژمارەکە جوت بێت ئەوا مانای کەهێڵەکە ڕاســتە هــەروەها ئەگەر ژمارەکە تاك بێت ئەوا مانای کەهێڵی پچڕ پچڕ دەگەیەنێ کەدوو ژمارەی شەش وهەفت ئاماژە دەکــەن بــۆ هێڵەکانی گۆران کەئەوەش لەچوارچێوەی کرداری گۆران دایە لەبەهایەکــەوە بــۆ بەهایــەکی تــر. پیتــی( x ) لەکراوەی هێڵی لێك پچراودا دابنێ بۆ نواندنی ژمارە -٦- هەروەها پیتی ( ٥ ) لەناوەندی هێڵی ڕاست دابنێ بــۆ نواندنی ژمارە -٩-بەو شێوەیە درێژە بەهاویشتنی پارەکان بدە بۆ شەش کەرەت تاوەکو شەش لایەك بەتەواوی بەدەست دەهێنی.

دوای ئەوە بگەڕێرەوە كۆتایی پەرتوكی (وەرگێرانی ولیەم وباینز)، كەواتە خشتەكە دەبینی كەتەماشای دەكەیت لەكویدا هەرشێوەیەكی شەش لایی دەبینی هێلكاری خوارەوە بدۆزنەوە (سێ هێڵەكە) لەلای چەپەوە لەخشتەكەدا كەهێلكاری سەرەوە لەلوتكەی خشتەكەدایە.ئەنجا لەكاتی خاڵی بەیەك گەیشتن وهێڵەكەدا ستون وهێڵ هەیە، دەبێ ژمارەی شێوە شەش لایەكە بێت كەبەدەستت هێناوە هەروەها ئەنجا كاتێك دەگەڕیتەوە بۆ دەخەكە (دەقەكە) بۆ خوێندنەوەی شێوە شەش لاییەكە، چركەیەك چاوەڕێ بكە بۆ كوڵ كردنەوەی باری خاوبوونەوە وسەرنجدان كەتەواو دەجوڵێنرێ لەماوەی چارەكاندنی پارەكردنی پارەكانەوە (یان داری یارن كەباشتر دادەنرێ). دەخەكە بەدەنگەوە بخوێنەرەوەو خواستی دەرچوونت لێی بەئەنجامەوەبێت یان كورت كراوە بێت.ئەنجا ئەگەر لەوێ هەر هێڵێك گۆرابێ، دەخی تایبەت بخوێنەرەوە كەلەگەڵیدا دەگونجێ.لەوێ ناوچە هەیە دەبێ پەرەسەندنی بارەكە تێیدا زۆرتر كەڵەكە بێت، كەلەسەریەتی زۆر فراوان بێت بۆ دەسەڵاتەكەت ئەنجا بۆ جاریك دابنیشە لەگەڵ وێنەبەرداریەكانت وبیرەكانت كەخوێندوتەوە ومانای لێك دەدەیتەوە وەكو ئەوەی خەونیك بگێڕیتەوە كە بینیوتە كاتێ لەبەیانیدا دادەنیشی.دوای ئەوە ئەو ئەنجامەی پەیامی پێت داوە بەروونی بە پێی توانا بینوسەوە.

كەخواستی وەرگرتنی (ئای جینگ) یەكەم جار لەسەرت دەبێ كە پرسیارەكانت بەڕوونی تەواو دابنێیت.كەیەكێ لەم رێگانە دەنوێنێ لەدەرخستنی داڵخەیەكی دیاری كراودا، چیت دەوێ كەڕووبدات؟ دوای ئەوە پرسیار بكە لەڕاستی ئەوە.......واتە ئەوەی دەتەوێ لە پەیام ئەویش ڕاستی یە دەربارەی ئەو شتە كەئارەزوو دەكەیت لەرووداندیاو لەهەندێ كاتدا پێویستت پێیەتی، لەبەر ئەوەی مانای دەبێ لە وەڵام دانەوەدا. كەلەهەندێك جاری تردا وەڵامەكان لەڕوونی دا دەبن بۆ ئەوەی وات لێ بكات سەرسامی بیت. بەڵام (ئای جینگ) لەهەردووبارەكەدا دەنوێنرێ، ئەمبارێكی گەورە لە پەندو زانینی گەورە، كەوابوو دەست پێ كردنی ڕێبازی وەستا ولەسەر پەندو زانین پێناسە دەكات سەرەرای جیاوازیان لە پەیڕەوكردندا لەبارێكەوە بۆ بارێكی تر.بەكورتی لەوێ وەڵامێك لە پەرتوكەكەدا نی یە، بەڵكو لەناوەوەتدا وەڵامەكە دەبینریتەوە.كەگرنگی پەرتوكەكە لێرەدا ئەو خزمەت كردنە تە لەجوڵاندن وپاڵ نانی زانین وپەندكەلەلات دەبینرێ.كەهەڵی دەگری بۆ هۆش ....ئەنجا هەروەڵامێك كە پێویستت پێیەتی لەناختدا هەیە واتە لەئاوەزی هۆشیاریتدا كەئای جینگ یەكێ لەو ڕێگا چالاكانەیە بۆ هەڵگرتنی ئەو وەڵامانە بۆ ڕووەكەی ئاوەزت.

## خوێندنەوەی گۆی كریستالی serying....

ئایا دەتوانی وێنەبەرداری كەسێكی دا پۆشراوبكەیت بەسەرگۆیەكی كریستالی گەورەدا لەژوورێكی كەم ڕووناك دا لاربۆتەوە ؟ئەویش خوێنەری گۆی كریستالیە كەئەم كەسە بەتوانایە لەسەر دەركردنی وێنەكان لەئاوەزی هۆشیاریەوە تا بیخاتە ناو گۆیەكی بلوریەوە، كەبەوەشدا بۆ چاو بینراوەبێت. زۆربەی خەڵكی هیچ بیرێكیان نیە لەسەر چاوەی هاتنی ئەو وێنانەوە، كەهەندێكی تر باوەڕیان وایە كەلەڕێگەی نیوبەندە بریكارەكانەوە

دەبێ وەك ئەوەی لەئاوەزی هۆشیاری خوێنەری گـۆی   کریـستالیەوە هاتبـێ.هاوڕێیـەکی گـە نجم هەیـە زۆر لەمێژە تائێستا لەگەڵ ئـەزمونێکی سەرسـامدا دەژی کەئـەویش بینینـی وێنـە بەرداریـەکانی  دیـاری کـراوە لەڕوانینی گۆشەیەکی تایبەتی پە نجەرەگەورەکانەوە یان جامی فرۆشگاکانەوە.بێ گومان ئەم ئەزمونانە کەڕوو دەدات بەشـێوەی لـەناکاوەو سەرسـامە، بـەلام بـەڕامان وتەماشـاکردن  لـەگۆی کریـستاڵی دەچـێت. دەشـێ پەیرەوکردنی خوێندنەوە لەم جۆرە لەسەر هەمووشتەکان بێت وەکو گۆی کریستاڵی (کەئێستا لە پلاستیك دروست دەکرێ)،هەروەها دیسان لەسەر پارچەیەکی کانزایی تەنك ودا پۆشراو بەڕووکەش کردن، یان تاس وتەشت بێت وپڕکرابێ لەئاوی ڕوون لەگەڵ نەبوونی  هیچ نەخش ورەنگێ لەبنەکەیدا. کەدەبێ  لەهەموو بارەکاندا گۆیەکە دانرابێ لەسەر پۆشەرێکی ڕەش کەڕووداني دەرکەوتەکانی پێ دەبێ. لەتواناتدایە دەستگایەکی تایبەت دروست بکەیت یان بیکریت. بەلام پێش ئەوەی دەستگایەکی تایبەت بەم خوێندنەوەیە بکریت یان دروست بکەیت ئـەوا یادت بهێنەوە کەخوێندنەوەی گۆی کریستاڵی جۆرێکـە لەشـارەزاییەکانی دەروونـی کەچـەندکاتژمێرێ لـە پێ هەستان  پێش بەدیهێنانی هەر ئاما نجێك دەخوازێ ئە نجا ئەگەر لەو جۆرەبیت کەبەئاسانی تێك دەشکێیت، ئەوا ئەم جۆرە لەخوێندنەوە بۆ تۆنابێ.ئەم  پێناسەی کەوا دێت  بخوێنەرەوە بۆ ئەو ڕێگایـەی بەخوێندنـەوەی گـۆی کریستاڵی پەرەی پێ دەدەیت  کەئەوەش بۆ بینینە ئەگەر دان بەخۆدا گرتنت بۆ پێشوازی کردنی هەرهەنگاوێکی سادە بەدرێژایی ڕێگا تێدایە ، یان هورەت لابێ بۆ درێژە پێدان هەتا بەئاوەز، لەسەر بینینی وێنەیەك لەسـەر دەستگای یـان کەرەسـتەی تایبـەت بـەوە بـەتوانا دەبیـت. ئاسـاییانە، هەڵبـستە بە پەرەگیریـەکانی لـەش خاوبوونەوە وهەناسە دان هەتا هەست بەئاسودەیی ولەش خاوبوونەوە دەکـەیت. دوای ئـەوە  بەتەماشـاکردنی ئاگایت سەرنج بدە لەسەر دەستگاو کەرەستەکە ئە نجا بیرۆکەکە لەئاوەزتدا دەڵێیت و ئەوکاتە تۆ دەتوانیت  چی لەناویدایە ببینێت. ئاگایەکەت  ووردبکەوە لەسەر کولایەکان وتێپەڕکردنی ڕووەکان.کەئەمەش لەدەستەلاتی دایە شارەزاییەکەت پەرەپێ بدات، کەوابوو بەکردەوە ڕووەکان بزر دەبن وتێپـەڕ دەبـن لـە بەئـەزمون کردنـی وێنەبەرداری کوڵ دا. ئەوەش ڕۆژانە  پێی هەڵبستە و خۆڕاگربە بـۆ ئـەوەی ئامادەبیـت بـۆم تاکیکردنەوەیـەی کەوادێت : لە پارچەیەك لەتەم ومژ دەردەکەوێت لەبەر دەمتا شێوە دەگرێـت و دەجـوڵێ و نـامێنێ وەکـو ئـەوە دەردەکەوێت. ناوەوە پڕدەکات کەئێستا تۆ لەسەر بینینی بەتوانا دەبیت. ئە نجا دوای چەند دانیشتنێکی تـاکی کردنەوە، تەم ومژەکەی یەکەم جار نامێنێ لەبەردەمتدا کەناوەوە کوولاییەکی گەورەتر وەر دەگرێ (تاریك تـر دەبێت، کە لەهەر دانیشتنێك دا بەم کۆناخانەدا تێدە پەڕیت: ڕووەکەی دەبینیت پاشان ناوەوەی دوای ئەوە تەم و مژ پێك دێت بەلام دوای ئەوە نامێنێت تا دەرکەوتنی کولایی تاریـك ی ڕێگـەی پـێ بـدرێ.ئێـستا کەرەسـتە شارەزایت لایەو بۆ بەکارهێنانی لەوێنەبەرداریدا.کە پێویستی بەچەند دانیشتنێك هەیە کەتیایا هـەمان لـەم کۆناخانەی شوێن بکەوێ کە پێش ئەوەی هەر وێنەیەك دەربکەوێ تا کۆتایی دێت، بەلام سـەبارەت بەخوێنـەری خۆڕاگر کەهوورەی هەبێ، ئەوادەبێ لەخالیکدا دەربکرێ.لەوکاتەدا دەتوانی کەبەخۆت بلێیـت خوێنـەری  گـۆی

کرســـیتاڵی.بەراســـتی وەرگرتنـــت بـــۆ بیرەکـــە کەخوێندنەوەی گۆی کریـــستاڵیە ئـەویش شـارەزاییەکە کەلکی دەبێ لەیارمەتی دانی چەندکەسێك لەماوەی بینینەوە کەهەسـتە سروشـتەکانیان بینینـی دەبـوێنرێ، کارکەریکی یاریدەدەرە لەتوند کردنەوەی هـورەت شـێوە دەگـرێ لەسـنوری خۆیـدا. لەبەرئـەوەی خوێنـەرێکی سەرکەوتوو دەبیت ....کەئەویش دیسان وات لێ دەکات لەخۆت تێ بگەیت و چالاکیەکەت بەکەڵك وخاوەن مانـا بێ. هەروەها سەرەرایی کۆنی ئەم شارەزاییە بەلاّم لەوەێدا کەمینەیەك لەخەڵکی هەن لەوانـەی گرنگـی دەدەن بە پێ هەڵستانی سەرەرای ماوەیەك لەڕاهێنانی وەرس کەر.هەروەها بۆ دروست کردنی دەستگایەکی تایبەت بەم شارەزاییە، پارچەیەك کانزای چوارگۆشە یان لاکیشە شێوەبێنە وبەبۆیەی ڕەشی کـاڵ بۆیـەی بکـەو دڵنیابـە لەنەبوونی چاڵی یان هەرگرنجیەك لەڕووەکەیدا، دوای کۆتـایی هاتن لەدروست کردنی، دەستگاکەت دووربگـرە لەبەرکەوتنی کەسانی تربۆی، کەبەوەش جگەلەتیشك دانەوەی دەرچوولێتەوە نەبێت هی کەسی تر هەڵنامـژێ کەدرێژ بوونەوەیەکە بـۆ دەروونـت ، پاشـان بیپێـچەوەو دای بپۆشـە بەدا پۆشـەرێکی رەش بـۆ ڕێگـری کـردن لەهەرتیشك دانەوەیەکی بەدەر لەتیشکدانەوەی زێری تایبەت بەخۆت هەمیشە پارچەیەك کوتاڵی ڕەش لـەژێر دەستگاکەدا دابنێ لەکاتی پێ هەستاندا بە تاکیکردنەوەکەوە، جائەگەر ئەودەستگایە پێك هاتبێ لەتاسـیکی کریستاڵی پڕ لەئاو، یان ڕوویەکی ڕەشی بریسکاوەی هەبێ یان گۆیەکی بلـوری لە پلاسـتیك بێـت. کەلـەکاتی بەکارهێنانی دا، پارێزی پێوەبکە لەشوێنێکی تاریك وداخراودا. ئە نجا بینینی وێنـەکان کاتێـك لەتواناتـدا دەبێت ، هەستەکانی ترت بەکاربهێنە لەیاریەکدا بۆ تێگەیشتنی مانای وێنەکان... کەوێنەیەکی سەرەتایی یان هێمایی دەبێت، کەلەهەندێك کاتدا لەسەرتە پرسیار بکەیت ((کامیان؟)) ....کەئاسایی دەبێ کاتێك وێنەکـە زۆر دووربێت کەمانای دووریە لەکاتدا، جائەگەر لەرابردوودا بێت یان لەئایندەدا، هەروەها ئەگەر نزیك بێـت لێت ئەوا دیـسان مانـای نزیکیەلەکاتـدا جائەگـەر لـەرابردوودا بێـت یـان لەئاینـدەدا....کەبـەبێ دەنگـی پرسیاردەکەم ((کامەیان؟))، کە دەبێ وەلاّم لەناوەوەی هۆشیاریتدا بەرزبێتەوە. پرسـیار لـەدەروونی نـاوەوەت بکە دەربارەی هەرشتێ کەسەرت دەسوڕمێنێ و بانگی بکە یارمەتیت بدات لەلێکدانەوەی ئەوەی دەیبینیت....بـۆ نموونە مانای وێنەکە چیە ئەگەر لەچە پەوە جولاّ؟ یان لەراستەوە جـولاّ؟ کەئەمـەش دەروونـی نـاوەوەت لێـی دەپرسێ.ئـە نجا دوای ئـەوەی کەشـارەزایی بەدەسـت دەهێنـی لەگەیـشتن بەدەرهێنانـەکانی ڕاسـتەو خـۆ دا لەدەستگاکەتدا کە دەتوانی بەدانانی داواکراوە دیاری کراوەکان دەست پێ بکەیت.

## زانینی پێش کاتینە- precognition

لەتواناتدایە بەتەنها بەم شارەزاییەهەڵبستیت یان لەگەڵ کەسێکی تـردا.....وەکـو ئـەوەی کەبەهـەڵهاتن وپێگەیشتن ناوی ببرێ......... لەسەر هەر یەکێکە کەدراوێکی نوێ بکاتەوە بۆ ئەم تاکیکردنـەوە تایبەتتانـە کەهەموو ئەوەی دەیبینێ تۆماری دەکات لەکاتی دانیشتنەکەدا، لەگەڵ تۆمارکردنی مێژووی ڕۆژ وکات وسروشتی هەواو خولیا. هەردانیشتنێکت بەرێگایەکی باش لەخاوبوونەوە دەست پێ بکە. کـەدەبێ ئاسـودە وهەسـاوەبیت

**لەسەری کەهۆشیار بمێنیتەوە بەوەی ئەم ڕاهێنانــە پێشگوێی کردن نییە بەئایندەوە، بەڵام تاکیکردنەوەیە بۆ تواناکەت لەخەیاڵ کردنەوەدا، واتە ڕێگە پێدانە بەو بیرانەو وێنانەوە چونکە لەئاوەزت پیـك دێـن بـەبێ هـیچ هـەوڵێ یـان نیگەرانیـەك. دەسـت بکـە بـەژماردنی پێـچەوانەیی بـۆ گەیـشتن بـەباری خاوبوونـەوەی هۆشیاری...واتە لەژمارە دەوە بۆ ژمارە یەك بژمێرە خەیاڵ بکەوە وەکو ئەوەی لەبەرزبونـەوەدا بیـت، کـەوابوو بەئاسانی سەربکەوە بۆ کولاّیی هۆشیاریت ئە نجا دوای ژماردنی پێچەوانەیی یەکەم، پرسیار لەدەروونی ناوەوەی خۆت بکە لەڕووداوێکت بۆ دەربخات کە رابردوودا خاوەن سورشتێکی ناکەسی بێت....چاوەڕێ بکە هەتا شتێکت بۆ دەربکەوێ، پاشان تێبینی بکەوە چاوەدێری بەوردی بکـە ئـەو ڕووداوە چـی یـەو کـەی بـووە؟ ئـە نجا دیـسان کاردانەوەکەت بۆ ئەم یادهاتنەوەیە. چیە؟ ئێستاهەڵبستە بەژماردنێکی پێـچەوانەیی تـر...لـەم کەرەتـەدا هەواڵ بەدەروونی ناوەوەت بدە تا پێش بکەوێ بۆ پێشەوە لەجیاتی ئەوەی بـۆ دواوەبێـت، ئـە نجا کاتێـك تـۆ دەیژمێریت خەیاڵ بکەوە کەتۆ وەستاویت لەسەر کاخەزیك دەسوڕێیتەوە لەناوئایندەدا.....کەباشـترە خـەیاڵی خۆت بکەیتەوە وەستابیت لەسەر راخەرێکی جادوویی، بەڵام گرنگ ئەوەیـە کەبـەڕوونی ڕای بکەیـەنی بـەوەی کەتۆ دەتەوێ بچوجوڵێت بەرەوکاتی ئاینده، واتە لەوکاتەی کەهێشتا ڕووداوی تێدا بەدی نـەهاتووە. ئـە نجا دوای ئەوەی دەگەیت بەژمارەیەك لەژمارن دا، بەبێ دەنگی بڵێ بەخۆت کەئێستا چویتە ئایندەوە، ئە نجا پرسیار لەدەروونی ناوەوەت بکە کەوێنەیەکت یان بیرۆکەیەکت بۆ دەربخات بۆ ڕووداوێك .بەدان بەخۆداگرتن چاوەڕوان بکە کەبەبێ ئەوەی ڕێگە بەشتێك بدەیت کەبەرهەڵستی ئاوەزت بکات.**

**هەروەها کاتێك کەتێبینیت کردووە وچاوەدێری هەموو شتێ دەکەیت بەرهەڵستی ئاوەزت بکە، چـاوت بکـەرەوە ودەست بکە بەتۆمارکردنی ئەزمونێك بەگشتی، جا پەیوەست بێـت بەیادەوەریـەکانی ڕابـردووەوە یـان ڕووداوی ئایندەوە....ئەمەش تەنها دانیشتنێکی ڕاهێنانە سەبارەت بەوکەسانەی کەتوانایـەك لەسـەر چـوونە نـاوەوە لەڕوداوەکانی ئایندەدا بەدەست دەهێنن.... کەلەماوەی چەندبارە بوونـەوەی دانیـشتنەکانی تاکیکردنەوەیـە، لەسەر پەرەپێـدانی ئـەو توانایـە کاردەکـەیت. لە پـەراوی تێبینیەکانتـدا بوارێـك وازلێ بێنـە بـۆ هەنـدێ لەلێدوانەکان دەربارەی ئەم ئەزموونە لەمەودوا. گوێ بگرە بۆ هەواڵەکانی ڕۆژانەکەبەبێ هیچ لەیەك چـونێك لەگەڵ ئەوەی پەیت پێ بردووە هەبێت. ئە نجا ئەگەر هەواڵەکان لەتەلـەفزیون ببینـی، ئـەوا لەتواناتدایـە کاربکەیت لەگەڵیدا وەکو ناوبەندیك بـۆ پەیوەنـدی کـردن لەگـەڵ دەروونـی نـاوەوەت دا، هـەروەها کاتێـك هەڵدەستی بەزانینی پێش کاتینە خەیاڵ بکەوە وەکو ئەوەی کەتۆ دەنگ بێژێك لەتەلەفزیوندا دەبیـستیت کـە ڕووداوێکی گرنگ ڕادەگەیەنی دوای ئەوە لەتەلەفیزیونـدا پۆشـراوێك بـۆ ڕووداوەکـە لەسـەر پیـشان دەری ( شاشەی ) ناوەوەت**

## ((خوێندنەوەکانی)) یـــــەك بۆیـــــەك-(readings) one to one

دوای پەرەپێدانی تواناکەت لەسەرپێشوازی کردن بەناو ڕاهێنانـەکانی ئامـاژە بـۆکراوی سـەرەوە. لەوانەیـە هەزبکەیت لەبەرهەم هێنانی توناکەت لەسەر هەستان بەخوێندنەوەکان بەبێ بەکارهێنانی هیچ کەرەستەیەك یان ژمارەیەك کە جۆرەکەی هەرچۆنێ بێت.بەراستی ئەوەی بەکاری دەهێنێ کۆگـەی (ئـەمباری) خەیاڵـەکانی ئاوەزیە کەکارت پێی کـردووە لەسـەر پەرەپێـدانی بـۆ لێدانـەوەی خەونـەکانت کەلە پەرەپێـدانی هەنـدێ لەشارەزاییەکانی دەروونی تایبەت دایە.بەڵکو لەهەر ئەزمونێکی ڕۆژانە دایە. بۆ نموونە کاتێك من دەستم کرد بەهەستانی خوێندنەوەکان.وێنەی پێڵاوێکم بۆ دەرکەوت لەگەڵم دەدوێـت.کە پێڵاوەکارکەرەکـە هـەواڵی دامـێ کەئەو کەسە بەراستی کاردەکات، پێڵاوە کۆنە باوەکە لەڕژێمەکانی بیرو باوەڕی کۆنیەوە هەواڵی دامـێ، بـەلام پێڵاوی پیاوان لەخوێندنەوەی ژنێکدا هەواڵی دامێ بەوەی کە هەستاوە بـەکارێك زۆرجـار بـەراورد بـە پیاوان دەکرێ ، وەهەروەها....واتە کاتێك ئەدوام پێڵاوەکە لێدوانی دەکرد لەگەڵمـدا لـەماوەی جوڵـەو گۆڕانیـەوە . ئە نجا پێیەکانی کەدەر دەچون لە پێڵاوەکانەوە لەبەرتەنگیەوە بوو بۆ چونەناو هەوایەکی پشوودەرەوە ئاماژە دەکات بۆ سەربەستی گەورەتر.کەهەندێ جار بەهێواشی یان بەخێرایی دەڕۆن یان بە نوێیی بن یان بەنیوداشتی بن... کەهەموو ئەم پێناسانە دەشێ کەشتێك لەخاوبونەکەیەوە بگوترێ.کەمانای توش بوونە بەچـوار کاخـەز بەختێکی باشە، کە پارچەیەکی ڕەش مانای پێچەوانەیە.هەروەها ئەگـەر ڕوودان و تـووش بوونکـە دوور بێـت کەبەرەو ڕوت دەجوڵێ، ئەوا مانای کەبەخت لەگەڵتدایە لەنزیکەوە.هەروەها ئەگەر پشیلەیەکی ڕەش کـشایەوە بۆ دواوە ئەوا مانای بەدبەختیە بەسەرت دەکشێت. کەدەتوانیت کۆمەڵی هێمای تایبـەت پـەرە پـێ بـدەیت بـۆ فێربوونی دەروونی ناوەوەت.ژمارەیەك لەکۆمەڵەکان هەستان بە پەرەپێدانی بیرەکـانی تایبـەت بـەهێماکان، نموونەش لەسەر ئەوە هێماکانن لەکاخەزەکاندا. لەوێ هێمای ترهەن کەئەویش لەسەر ئاسـتی جیهانـە وەکـو بەشێك لەئەزموونی مرۆیی هەر وەکو درەختی (یانیع) لەکاتی بەهاردا، کەبەهەموو ماناکانی هێماییەوە وەکـو ڕەنگی سەوزە کەمانای گەشە وتەندروستیە. ئێمە هەڵدەستین بەشارەزاییەکانی دەروونی کە خواسـتی تێبینـی شتەبچوکەکانە کەسەرروومان دەکەون بەبێ ئەو هۆکارە و بەڕاهێنانـەکان هەڵدەسـتن نـەك لـە پێناوی ئـەوەی کردەوەیی بین بەڵکو لە پێناوی ئەوەی (پێ هەڵـساو) بـین کەلـەماوەی پـێ هەڵـستاووە دەتـوانین تێبینـی جیاوازیە ووردەکان بکەین کەنامانەوێ پەی پێ بەرین کەلەسەرکەوتن یان شکیستدا دەردەکەوێت.کەلەڕاستیدا سەبارەت بەئێمە خوێندنگەیەکە. هەروەها دیسان لەماوەی پێ هەڵستانەوە، چۆنیەتی جیاکردنـەوە لـەنێوان زانیاریەکانی خاوەن بـەهادا فێـردەبین کـەدێت بـۆ هۆشـیاریمان لەبەرنامـەی تایبە تمانـەوە کەکەلـە پوری ڕۆشنبیریمانە، کە ئێستا ئەویش دیاری کراوە، هەروەها دیسان لەوێنەیەکی ڕوونەوەیە کـەنادیاریکراوە بـۆ شتێك لەدەرەوەی دەرونمان. و ڕیزبەندی هەموو شتێکمان فێردەکات لەسەر ئەوەی کەباشە یان خراپە، ڕاسـتە

یان هەڵەیە مانادارە یان بێ مانا ومەبەستە.ئە نجا لەکاتی پێ هەڵستاندا فێردەبیت چۆن بەهاو داب ونەریت وخووەکان وفێربوونەکان وبیروباوەڕەکانی تایبەت بەخۆت فێردەبیت کەلەماوەی پەیبردنی هەستی بالاَوە دەتوانیت بگەیت بەراستیەکان....کەلێرەدا ئەگەر لکابوو بەبیروباوەرتەوە یان ئەوەی دەروونت بەباشی دەزانێ ئەوا تۆ دەروونت پەروەردە دەکەیت و وای لێ دەکەیت بۆت گەشەنەکات.بەتوانینی دەروونت کەلێدوان دەکەیت بەبەخشینی دووبیر لەیەك کاتدا. نمونەیەکت دەدەمێ لەسەر چۆنیەتی تێپەڕبوونم بەم ئەزموونەدا وانەکانم لەسەر کۆمەڵێك لەخوێندکارەکان دەربارەی شارەزاییەکانی دەروونی دەداسەوە کەبڕیارم داوە هەستم بە پیشاندانیك بۆ یارمەتی دانیان لەوەرگرتنی ڕاستی شارەزاییەکانی دەوونیدا. هەستام بە خوێندنەوەی خێرا بۆهەریەکێك لەوانە و ئە نجا من دەسورامەوە بەدەوری ژوورەکەدا لەچە پەوە بۆ ڕاست....کەلەدەمی گەیشتنی یەکێکیاندا لەچاوی ئاوەزمدا بینیم دەکەویت و بەخێرایی گەورە لەسەر خلیسکانە.شوێن هەڵگرتنم لێیەوە کەبێجگە لە ڕاهێنانیکی کەم نەبێت لەخلیسکاندا پێی نەگەیشتووە کەبەخێرایی دەجوڵێت بەوەی کەدیمەنی سروشتی تەنها سەبارەت بەئەو تەم ومژدەر دەکەوت. ئەو وێنەیەم پێناسەکرد کەبزر بۆوە بۆ ئاوەزی هۆشیاریم بۆ ئەو خواستە پێناسە کرد کە دانی پێدابنێ بەکردەوە هەستاویت بەوە کەماوەیەکی کورتە...کەوابوو کەوتن لەسەر خلیسکانی تایبەت بەخلیسکێنەرانی پێشکەو توو هەرچەند خاوەنی هیچ پێ هەستانێکی کردەوەیی لەخلیسکاندا بەدەست ناهێنێ هەروەها دیسان دان بنێ بەوەی کەبەخێرایی دەردەچێ وشتێك نابینرێ لەڕێگادا بۆ خوارەوە.کەلەڕاستیدا وردە لەبەدەست هێنانی زانیاریەکانی پیشەیی دەربارەی یەکێ لەچالاکیەکانی .بەلاَم شێوەپێوەگرتن مانای لەوەی زۆرترە پرسیارم لێ کرد کەئەمە ڕێگەکەیەتی کەژیانی پێی دەروات، واتە پێشبڕکێیەکە بۆ چارەنووسی بەبێ ئەوەی بڕوانێ بۆ ڕاست یان چەپ، یان جوڵەی کەهێواش بکاتەوە ((بۆ بینینی گوڵەکانی بەهار)) یان نرخاندنی جیهان لەچواردەوری دا. کەوەڵامی دایەوە ئەویش بەکردەوە وایە.کەلەسەریەتی باوەڕ بهێنێ کەلەڕۆژێکدا دەبێت، نەبوونی شارەزایی یەکەی دەبێتە هۆی بۆ گەیشتنی مردنەکەی.

کەبێ گومان هەنگاوی هێواش لەگەڵ پێ هەستانی گەورەدا بۆ هەر شارەزاییەك جۆرەکەی هەرچۆنێ بێ والەژیا نمان دەکات زۆرتر ئارام وبەرداربێت. بۆ ئەوەش ئەو وێنەیەی کەبەدەست دێت بۆ ڕوودانێکی ڕاستینەیە بەهەموویەوە ڕوویداوە بەلاَم گرنگیەکەی مەلاس داوە لە پشتی ئەو ڕووداوەوە..واتە کەدەروونە، لەراستیدا، ئەو چالاکیە تایبەتەی هەڵبژاردووە بە پێناسەدانی باشترین بۆ یارمەتی دانی نموونەیە لەڕازی کردنی بەراستینەی پەیبردنی هەستی بالاَ.هەروەها لەهەمان ئێوارەدا، کاتیك دەسوڕامەوە دەربارەی خوێندکارەکان، وەستام لەلای کچێك وبەگرنگیەوە سەرنجم دا لەسەری، بۆ وەرگرتنی شێوەپێوەگرتنەکان لێیەوە کەخۆم کردەوە وێنەی دەستێکم لێ دەرکەوت کەدەنێکی هەڵگرتووە و لەدەستەکەی تریشیدا پەرداخێك لەئاوی هەڵگرتووە.هەستم کرد کەئەوەش دەنکی ئەسپرین نە کەئەوەم گوت لە پێناسەمدا بۆ وێنەکە.دەم وچاوی کچەکە

بزركا وسەری ڕاوەشاند ونەهی كرد لەوەی پێم گوت، بەڵام خوێندكارەكەی دانیشتبوو لەتەنیشتمەوە ووتی ((من ئەو كچەم كەهەڵت بژاردووە)) كەوابوو ووتی كەمنم دانیشتووم هەستم بەئازارێكی توندكردووە لەسەرمدا خوا خوام بووە كەیەكێكتان دەنكی ئیسپرین لەگەڵ پەرداخێ ئاودا بۆم رەت بكەن.كەئارەزووی ئەو كچە لەهێزێكدایە تابەس بێت بۆ ئەوەی نیشتەجێ بێت لەنێوان كچكەی كەسەرنجمم لەسەری داوە ولەنێوان ئاوەزی هۆشیاریم دا، هەمان بیرۆكە ناچاربووە ئاگایم ڕاكێشێت...كەئەوەش نموونەیەكی باش بوو لەسەر هەڵگرتنی شتێك لەجێگەی خۆیدا نەبێت كەزۆرجار دەردەكەوێت.هەروەها لەبۆنەیەكی تردا تێپەڕ بووم بەبارێك لە پێش گۆیی پێشكات كەوابوو كاتێك بەهێمنی دادەنیشتم لەگەڵ كوڕەكەم دا ولەباری ئامادەبوون دا بووم بۆ پێشوازی كردنی هەرزانیاریەك كەیارمەتی بدات و دوای چەند چركەیەك لەسەرنجدان لەسەری كەلەكاتێكدا تیادا ئاوەزم خاڵی بوو لە هەر بیرۆكەیەك، بۆ ئاوەزی هۆشیاریم زنجیرەیەكی خێرا لەڕووداوەكان ئامادە بوو.شت زۆرم گوت وەكو ((تۆ دابەزێنراوی تازە بۆ ماڵەكەت ڕادەگەیەنی سەرەرای ئەو كۆمەڵەیەی كە تیانیشتەجێن.... ئایا ئەمە ڕاستە؟ وەڵامی دایە بەدروستی ئەوەی پێم گوت . پاشان گوتم لەوێدا سێ كەس هەن وەڵام لەسەر ڕاگەیاندنەكە دەدەنەوە، بەڵام كەسی سێ هەم خۆیەتی بەختی دەبێ لەژوورەكەدا.ئەنجا ئەگەر ئامۆژگاریەكەم دەبیستی ئەوا من دەبینم یەكەم گەنجی ڕووخۆش وسەرنج ڕاكێشی وئامۆژگاریت دەكەم بەداواكردنی پاڵپشتیەك كە پێش پەسەندكردنی ڕەوشتی تیاببینرێت كەئەمیش ئارەزووی لەكردنی ناكات ئەنجا نائاسودە دەركەوت بەبیرۆكەی خواستێك لە پالپشتی.ئەنجا دیسان گوتم دەبینم پەرتوك خانەكەت لەگەڵ باوەڵەكە چەكی پارەی پڕنەكراوە لەسەریەتی كەناوەكەت لەسەر چەكەكە چاپ بووە...ئایا ئەمە ڕاستە؟! وەڵامی دایەوە كەئەمەش ڕووی داوە.هەروەها من گەنجێك دەبینم كەچەكی پڕنەكراوەی بەدەستەوەیەكە ئەوەش ماوەی سێ ساڵە بەكاری نەهێناوە.بەڵام كاتێك بڕیك لە پارەت زۆر دەبێ لەبانكدا ئەوا بەكاری دەهێنی بۆ سوخت بوونت)) پاشان داخوازیم لەكوڕەكەم كرد لەكاتی نەبوونی خواستی ئەو گەنجەدا بە پاڵپشتیەك لەڕەوشتیەوە، ئەوا باشترە كە پەڕاوی چەكی پارەكەی دا بخات.بەڵام كوڕەكەم ئەو ئامۆژگاریەمی پەسەندكرد. كەكورت كرایەوە بە ووتەیەك كەئەگەر لەوگەنجە داوای پاڵپشتی كرد ئەوا هەمووشتێ باش دەبێت.بەڵام كەسی دووەم ژوورەكە وەرناگرێت هەروەها كەسی سێهەم كچێك دەبێ كەمامۆستا دەبێت .كەئەو كچەش زۆرجوانە و پێی ئاسودە دەبی لەبەرئەوەی یەكێك لەكۆمەڵەكە دەبێت كەلەماڵەكەدا نیشتەجێ دەبێت. كوڕەكەم بڕیاری گوێگرتنی دابۆپێشنیارەكەم. ئەنجا لەكاتی پێشوازی كردنی گەنجە جوانەكە بۆ وەرگرتنی ژوورەكە داوانی پاڵپشتی لێ بكە، ناوی دوای داكەئەویش دلّ خۆش كەر بوو كەووتی جارێكی تر پەیوەندی دەكەمەوە بۆ زانینی ئەنجامەكە.ئەنجا كاتی پەیوەندی كردن بەژمارەی یەكەمەوە وەڵامی دایەوە بەوەی كەزۆرجار شوێنێك سازدەكات بۆ خواردنەوەی كۆفی (قاوە) بەڵام زانیاری كەسی نازانێ.بەڵام ئەو ژنەی كەلەسەرتەلەفۆن وەڵامی دایە ئەوا گوتی كەهەرگیز نەیبیستووە...بەڵام ئەویش دووبارە پەیوەندی ناكاتەوە بەڵام پێشوازی كەری دووەم

**بۆ چوونەکەی گۆڕی....لەکاتێکدا پێشوازی کەری سێهەم کچێکی جوانە کاری مامۆستای هونەرەکانە کەوابوو گواستیەوە بۆ ماڵەکە بۆ نیشتەجێ بوونی لەگەڵ کۆمەڵەکەدا. هەروەها ئەو خاڵەی دەمەوێ بیڵێم لێرەدا ئەویش کە پێویستە لەسەرت وەرگرتنی ناوەڕۆکی نامەکەبێت کەسەرچاوەیەك نییە بۆ ئەو نامەیە. بەراستی زانیاریەکان بەختمی لەگەڵ دابوو لەتێپەڕکردنیدا بۆ کوڕەکەم بە پڕکردنەوەی .ئامۆژگاری باش بوو بەچاوپۆشین لەسەر چاوەی هاتنی زانیاریەکانەوە.... وەستا ومەترسە لەبەردەم دەرکەوتەکانی دەرویتدا.**

**شایەن نیت بەوشەکانی ئاگادارکردنەوە بەبێ لێ تێگەیشتنی، بەڵکو هەمان داڕشتن پەیرەوبکە کە پەیرەوت کردووە بۆ گەیشتن بەئامۆژگاری لەهەر سەرچاوەیەکەوە بێت..ئە نجا فەرمانی بەسەردا بدە لەماوەی ناو ئاخنەکەی وجۆرەکەیەوە نەك لەماوەی شوێنی سەرچاوەکەوە یان دەستەڵاتەکەیەوە.**

**ڕاهێنانی ژمارە -١- لەخوێندنەوەی دەروونیدا ( دوکـــــــــەس )**

**خوێندنەوەی دوکەس دەخوازێت: خوێنەرو کەسی ئارەزوومەندی خوێندنەوەی دەرونەکەی...کەلەسەر کەسی دەروون خوێنراوە نییە. بێجگە لەگوێگرتن بەگرنگی یەوە نەبێت لەوەی دەروونە خوێنەر دەیڵێت کە تێبینیەکانی تۆمار دەکرێت لەسەر پەراویك کە لەئایندەدا بۆی دەگەڕێتەوە.هەروەها لەسەر خوێنەری دەروونییە دیسان دابنیشێ بەئارامی وخاو بوونەوە بۆ چوونە ناوباری نائاوەزی کەلەگەڵ شارەزاییەکانی دەروونی تردا پێی هەڵدەستێ.......کەبانگی خەیاڵەکان وبیرەکانی بەرز بووەوەو دەرکەوتوو دەکات بۆ ئاوەزی هۆشیاری....کەلەکاتی چوونە ناوەوەی بابەتێك بۆ هۆشی، ئەرك دەبێ لەسەر خوێنەری دەروونی کە بەزار دەربارەی ببڕێ بۆ دڵنیابوونەوە لەدرێژە پێدانی کەڵەکە بوو. هەرچیەك دەچێتە هۆشمەندیتەوە لەدوای بیرۆکەی ئێستاوە کۆی بکەرەوە، بانگی هەموو بیرەکانی ڕابردووبکە خێرادەربچن ئە نجا کاتێك تۆپێناسەی ئەوە دەکەیت کەلەناو هۆشیاریتدا هەیە، گوزەر دەکات ئەوەی بەلای تۆوە مانای هەیە. هەروەها سروشتی هەستی هاوەڵ پێی چییە؟ ئە نجا کام وەڵامەی بۆ تۆ یە ئە نجا بیرۆکەکە دەبینی یان خەیاڵێك دەمێنێتەوە تاکو دەتوانی لییەوە دەربڕی بە پێی توانا. لەسەرەتادا، خەیاڵەکان بەخەون دەچن کەلەسەرتە بگەڕێیت لەلێکدانەوەی هەروەکو ئەو بارەی لەخەونەکاندا هەیە، لەجیاتی وەرگرتنی وەکو ڕاستیەکی پیشەیی. لەسەرتە کە دڵشاد بیت بۆ بەخشینی ڕێژەیەکی گەورە لەبابەتەکانی نادروست. کەلە سەوزکردنەوەی خەیاڵەکاندا لەوێدا هەندێ لەجیاکردنەوەکان و ڕێکخستنەکان هەیە کەهانت دەدات...ئە نجا بەتێپەڕبوونی کات ولەگەڵ پێ هەستانیدا، ئەو ڕێکخستنانە دەستەڵاتدار دەبن، کەوابوو خەیاڵ کردنەوەکان زۆرتردیاری کراوەدەبن ولێکدانەوەکانی بازدەدەن بۆ هۆشت بۆ بڵاوبوونەوە ودزەکردنی لەدەمەوە بەسەربەستی وباوەڕ پێ هێنانی گەورەتر. لەسەرەتادا ڕۆڵی خۆت وەکو خوێنەری دەروونییە، ڕەنگە بەردەوام نەبێ بێجگە لەچەند خولەکێ نەبێت کەهەوڵێك دەکات پەرەپێدانی شارەزایی نوێ لەسەرت وئاسان دەکات.**

**ڕابوەستە کاتێك هەست بە پەژارە یان ماندوو بـوون  یان نەبوونی باوەر دەکەیت، هەروەها گفـت وگـۆی ئـەو بابەتەبکە کە بەدەربڕین لێ یەوە هەستاوین بەراستی هەر (( پێکاندنێکی دروست )) یان ئـەوەی لێیـەوە نزیـك دەبێ هانت دەدات کەلەهەڵەکانتەوە زۆر فێرببیت. .هەروەها تۆ کاتێك خەیاڵێك یان هێمایەك یاد دەکەیتەوە ، ڕەنگە ببینی کەچۆن تۆ لێکدانەوەیت خراپ کردووە، کەبەوەشدا دەتوانی تێگەیشتنت بـاش بکـەیت بـۆ زمـانی هێمای دەروونی ناوەوەت. لەتوانتدایە خولەکەکان ئـاڵ وگـۆڕ بکـەیت وبـانگی کەسـێکی تربکـەیت.دەروونـت بخوێنیتەوە کاتێك تۆ زانیاریەکان تۆمار دەکەیت.بۆ پێشەوە وبۆ دواوە بڕۆ چـەند کـەرەتیك کەهـەزت بـەوە هەیە، بەڵام بەبێ زۆر ڕۆیشتن.**

**کە ئەویش خولیای باوە لەنێوان فێرخوازەکاندا لەبەر ئەوەی کەلك وەردەگرن بە پێ هەسـتانی ڕاهێنـانی نـوێ بەبێ بەسەربردنی کاتیکی لەبار. ناوئاخنەکانی ئاوەزی هۆشیاری پێ دەگوترێ کەئەویش لەدەرەوەی هۆشیاریە بەڵام بەئاسانی بەدەست دێت واتە لە پێش هۆشیاریەوە.هەروەها بانگ هێشتی دەکـەین بەناهۆشـیاری هـەموو ئەوەی داخراوە لەهۆشیاری دا. زۆرجار بڕیارێك پوخت دەکات.دەروونەوانەکان مادەیەکی دا پۆشراو لەهۆشـیاری لەلای بلبلەی چاویان هەیە کەبەوەش دا تێدەگەیشتن یارمەتیان دەدات لەسەر ئەوەی ڕێگری دەکات.کەئەمـەش ڕوودەدات لەگەڵ دەروونی هۆشیاری ناوەوە، کەلەڕێگەیەوە پەی دەبەین بەوەی لەهۆشمان دەردەچێ، کاتێك کـە سەرنجمان بەئاگایمان لەسەر هۆشیاری کەسێکی تر نەبێ. کەوێنـەکان وهەسـتەکانی بـەراوورد کراو پێیـەوە دەبینرێ.بەراستی گرنگی پێدانی خوێنەری دەروونی بینینەکـەی خۆیـەتی بـەڕوونی هـەروەکو ئـەوەی هەیـە، کەلەماوەی بیرەکان وبیروباوەرەکانەوە نیە کەهۆشیاری خوێنەر خۆی پڕدەکاتەوە. خواستێکە کەکەرەسـتەیەك بۆ زانیاریەکانی پوختەکراو دەبێ کە دان بەخۆدا گرتن وگرنگی گەورە دەخوازێ. ..کەبۆ ڕێگری کردنـی ئـەوەش لەخراپ بوونی گەشتی خودەوە دەبێ، لەسەرتە کەهەڵ بستی بەڕاهێنانەکانی تایبەت بۆ کەسێکی تر، هەروەکو ئەو بارەی لەگەڵ نیوبەندەکاندایە لەسەر جۆرە جیاوازەکانی دەبێ کەهەنگاوەکان دروست بن، هەروەکو ئەوەی پێشتر پێناسەمان کـرد کەئـەوەش بـۆ بـەرگری دەروونیـت و بیلبیلـەی چـاوە لەگـەڵ ئـەو بۆشـاییەی کـاری تیادەکەیت. ..ژوورەکە هەمووی بەرووناکی سپی ڕوناك کرابێتەوە ولەناختدا بەرگری وسەرپەرشـتی داوابکـە، . یادت بهێنەوە کەڕاهێنانەکان لەم کەرتەدا بۆ یارمەتی دانتـە لەسـەر پەرەپێـدانی تواناکانـت لە پـەیبردنی دەروونیدا، کەدەبێ هەموو هەڵستن لەچوارچێوەی باریك لەخاوبوونەوە. کۆشش بگۆرە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن لەهەر بوارێکدا بێت دەشێ کەڕیگری کەڵەکە بوونی زانیاریەکانی پـەیبردن بێـت.ئێـستا بەهـەموو ڕاهێنانـە تایبەتەکان هەستاوی بە پەرەپێدانی تواناکەت لە پەیبردنی دەروونیدا، ئێستا بگوێزەرەوە بۆ کەرتەکـەی تـر بۆپێ هەڵستانی ڕاهێنانەکانی تایبەت بەشارەزاییەکانی دەرخستن.**

# کەرتی حەفتـــــــــــــەم

## ڕاهێنانی شارەزاییەکانی دەرخستن

دەرخستن لەسەر شێوازی پەیبردن بەدەن وئاوەزێکی ئارام وخاوەدەخوازێ. پەیبردن لەسەر بیرۆکەیەك هەڵدەستی کەکەسەکە پەکی دەکەوێ لەوەی هاتووە.بەلاّم دەرخستنەکە هەڵدەستێ لەسەر بیرۆکەکە ئەو کەسە لەناردنیدا بۆ دەرەوە پەکی دەکەوێ.دەرخستن بەئاسانی ئەو پێهەستانەیە بـۆ چۆنیەتی سـوك کردنـی شـێوەی بیرۆکـە ئاوەزیەکە وبارگاوی کردنیەتی بەووزەی لەبار کە لە پاشاندا بەری هەڵدەدات...سەرکەوتنی توانای دەرخـستن پشت دەبەستێ بەدوو هەنگاویبنەڕەتی:- یەکەمیان سوك کردنی بیرۆکەکەیـە، کـەدەبێ بناسـرێ بـەروونی و بەووردیەك ئەو بیرۆکەی کە لەدەرخستنیدا ئـارەزووی هەیـە. بـەلاّم هـەنگاوی دووەم: ئـەویش بـەرەلاّکردنی بیرۆکەکەیە.ئەنجا کاتێك بیرۆکەکە سوك دەبێ وبارگـاوی دەبـێ بـەووزە، دەبـێ بـەری هەڵبـدرێ بـۆ خـودی ناهۆشیاری. وەکو ئەوەی کە زانیوتە بیرت چۆتەوە.لەهەندێ کاتدا باوەر دێنیت کەتۆ ڕێگەت داوە بەدەرخستنی بیرۆکەیەکی دیاری کراو بەلاّم شتێك ڕوونادات هەروەها کاتێك ئەویش باریك دەبێ کەئەمەش دەگەریتـەوە بـۆ ئەوەی بیرۆکەکە گەمارۆدراوە لەسەر ئاستی ناهۆشیاری هەرچەندە کـەتۆ بـەرت هەڵـداوە( بیرۆکەکـە ) لەسـەر ئاستی هۆشیاری. هەروەها کرداری دەرخستنی بیرۆکەکە لەسەر هەمان دەست پێکی گێرانەوەی دەبێ، واتە کەتۆ دەی هاوێژی بەلاّم دوای ماوەیەکی بۆت کورت دەگەریتەوە.کەناشێ بۆ بیرۆکەکە بۆت یگەریتەوە بێجگـە لـەوەی کەتۆ ڕێگە بەگەرانەوەی بیرۆکەکە بدەیت.تۆلەڕاستیدا بەکرداری دەرخستن هەڵدەستیت جائەگەر پەی پێ بەریت یان نەبەیت.ئەوا هەموو مرۆڤێ هەڵدەستێ بەوە...بڕوانە بۆ ژینگەکەت ئەوەی دەبیینی ئەنجامێکە بۆ زنجیرەی دەرخستنەکان .کەبیرەکان شتەکانن، کە پێش دروست کردنی هەرمادەیەك بیرۆکەکە دێت یان بۆچـونی تاییـەت بەوە دێت.کەلەسەر هەمان شێوازە، ئەنجا پێش ئـەوەی کەهـەر ڕووداوێ دەربکـەوێ.ئـەوا کەسـێك بـیری لـێ کردۆتەوە وەکو باری چاوەڕوانکراو. کەڕووداوەکە گەورەترین هێزی ئاوەزی بەردار تێدا بەدەست دەهێنـێ، هـەر ئەویشە کەدەبێ بەڕاستینە.دەبێ کەهۆشیاربێت بەوەی کـەباوەری پـێ دەهێنـێ یـان هەسـتی پـێ دەکـەیت و یارمەتی دەدات لەسەر گۆرانی جیهانی دەرەوەی خۆت ودەروونت.دەشـێ کەدەسـت پـێ بکـات بەریکخـستنەوەی بارودۆخی ژیانت لەماوەی ڕێکخستنی هۆشیارانەوە بۆ نواندنی بیرۆکەکە بەتـەنها کاتێـك کـە بـۆ دەرەوە دەری دەکەیت هەروەها کاتی پەرەپێدانی تواناکانی دەرخستنت بیهێنەوە یادت کەهـەموو ئـەوەی دەری دەخـەیت بـۆ دەرەوە پێچەوانە دەبێتەوە لەچوارچێوەی ژینگەتدا. کەنواندنە ڕووخێنەرەکان ڕمـان وڕوخـان بـۆ دانەرەکـەی ڕادەکێشێ بەلاّم نواندنە دروست کەرەکان ئەوا لەژینگەی کەسی گونجاوەوە بەرهەم دێتەوە ، ئێمە زۆرجـار لێـی دەترسین یان بەئاگاین لێی بۆخۆمانی ڕادەکێشین.ئەگەر وێنەیـەکی ڕوونمـان دروسـت کـرد بـۆ شـتێك لێـی دەترسین، ئەوا کاردەکەین لەسەر بەهێزکردنی وێنەکە لەماوەی چەندبارە بوونەوەی ئەو وێنەبەرداریانەی کـە

هی ڕووداوێکی ترسناکە ئەنجا لەپاشاندا پڕی دەکەین بەهێزی هەستمان . ئەنجائەوەی کەلێی دەترسین دێتە دی وڕوودەدات بەومانایەی کە ئێمە بەخۆمان بەدەستی خۆمان بەلاو بەسەر هات دروست دەکەین.ئایا ئەوەی لێی دەترسی تەمەنات کردووە لەڕۆژێکدا ڕووبدات ؟... لەم بارەدا دەروونی ناوەوەت نێردراوەکەت وەردەگرێت وبۆت بەدی دەهێنێ بەکورترین خێرایی شیاو خواستی لابردنی نیگەرانیەکەیە لێت. چاوەدێری کەسیك بکە، دوور دەبێ لەوەی کەژنەکەی لەدەست بدات ....کەهێرش بردن ئاشکرادەبێ لەهەڵس وکەوتی خۆیەوە یان لەهی ژنەکەیەوە..دیارە کەهەردووکیان کاردەکەن بۆ بەدیهێنانی ئەو لەدەست دانە، کەهەردوکیان ئەگەر لەهۆشیاندا بڕواشیان بەوە نەبێت ناتوانین کەبەرگەی زیانێکی هەڵواسراو بۆ ماوەیەکی درێژ بکەین، لەسەرمانە کەدەروونی ناوەومان کاربکات بۆ ڕزگارکردنمان لەئەو نیگەرانیە لەوکاتەدا بەدەنگی بەرز دەڵێین: ( ئەوەم پێ نەوتی )...واتە ترسی لەدەست دانی شتێك ڕزگاری دەبێ بەلەدەستدانی ئەو شتە. لێرەدا ئەوەی چاوەڕوانی دەکەیت بەدەست دێت....تۆ ئەنجامی دەدەیت وپاشان فێردەبیت کەئەوەش لەماوەی پەیبردنێکەوەیە کە ڕوودەدات. ئایا کارتێکردنی خواستراوت بەدەست هێناوە؟ کەئەوەش وانابێت چاوەڕوانیەکانت پیشان بدە لەگەڵ سەرنجدان بەشێوەی تایبەت لەسەر چاوەڕوانیەکانی ناهۆشیاری کەبەبەریەکدا دێن لەگەڵ ئەوەی کەلەهۆشیاریتدا هەیە.دوای ئەوە جاریکی تر هەوڵ بدەوە و...کاربکە لەسەر هەمەجۆری شێوازەکان یان ئەو ڕێگایەی کەبەدەست دێت لەسەرکارتێکردنی خواستراو. دەشێ ئامانج لە پەرەپێدانی شارەزاییەکانی دەرخستن لەدروست کردنی بارودۆخێکی باشتردا بێت بۆ ژیانتزکەهەوڵدان بۆ بەدیهاتنی توانا لەشارەزاییەکانی دەرخستن دا بەکات لەدەستدان دەژمێردرێت. بەراستی کەلك گەیاندنی بەسەر ژیانی کرداریدا بۆهەمان گشتگیرنابێت.

## ناردنی هاوبیری:

هاوبیری لە پەیبردن ودەرخستنی پێك دێت کەدوو جۆر لەکەسەکان دەخوازێ واتە نێرەر و وەرگر. هەندێك لەئێمە وەکو وەرگرێکی باش کاردەکات وهەندێکی ترمان وەکو نێرەرێکی باش کاردەکات، بەلام بە پێ هەڵستان دەتوانیت پێ هەستاو شارەزابێت لەهەردوکیاندا.

ڕاهێنانی ژمارە -١-لەناردنی هاوبیری دووکەسدا.

کەسێك دیاری بکە ئارەزووی هەبێ لەسەر تەلەفۆن لێدوانت لەگەڵ بکات یادت بهێنەوە کە پێویستە نەبیتە هۆی هیچ بێزاریەك بۆ کەسی وەرگر. لەسەرەتادا کەسێك هەڵبژێرە کەباوەرت وایە پەیوەندیت پێوە دەکات بەهەر ڕێگەیەك بێت. واتە کەسێك دەدۆزیتەوە کەبەئاسانی دەخوازێ پەیوەندیت پێوەبکات.

ناوی ئەوکەسە بنووسە لەسەر پارچەیەك کاخەز.

ئێستا چاوەکانت دا بخە وسەربکەوە بۆ دواوە بەخاو بوونەوەیی.خەیاڵ بکەوە دیمەنێك دەبینیت تۆی تێدایت لەگەڵ ئەوکەسەدا، ئەنجا ئەگەر بەووردی زانیت شوێنەکەی ئەوکەسەی کە تیادەبینرێت، جالەماڵ بێت یان

لەفەرمانگــەبێت ئەوکاتــەی خــەیاڵ لەوکەســە    دەکەیتەوە درێژەکاری ناڕوونی پشتەوەی واز لێ بێنــە. بەتەماشاکردنەکە سەرنج بدە لەسەر دەم وچاوی ئەوکەسە....چاوەکانی ببینە کەدەدرەشێتەوە ئە نجا چاوەدێری جوڵانی کەسەکە  بەرەو تەلــەفۆن بکــەرەوە... پە نجــەکانی ببینەکــە کــەژمارەی تەلــەفۆن لێ دەدات.ئــە نجا بیسەرەکە ببینە کەلەرێگەدایە بۆ گوێچکەی.....بەکورتی هەموو هەنگاوەکان ڕوون ودروست بکە.خەیاڵ بکــەوە هاوڕێکەت بخەوە خەندە ودەڵی ( بەڵی ) ئە نجا تۆش بیسەرەکە بەرزدەکەیتەوە ووەڵامی دەدەیتەوە.زیانی نییــە کەهەز بکەیت بەتۆمارکردنی زنجیرەکە لەسەر کاخەزێك پێش ئەوەی چاوەکانت دا بخەیت بۆ خەیاڵ کردنەوە بۆ ماوەیەك سەرنج لەسەر ئەوە بدە لە پێنج خولەك کەمتر نــەبێت. دوای ئــەوەبانگی ڕووداوەکــە بکــە لەهۆشــتدا بەربێتەوە.ئە نجا ئەگەر نەگەیشتی بەئاگاداریەکە لەچوارچێوەی ماوەیەکی ژیرانەلەکات، ئــەوا ڕاســتەو خــۆ پەیوەندی بەهاوڕێکەتەوە بکە.کەهاوڕێکەت نامە نیردراوە کەوەردەگرێ، بەڵام کاری لەگەڵدا ناکات بانگی ئەم ڕووداوە بەربێتەوە..... پرسیاری لێ بکە کەتۆ لەدەزگای ئەم  بیرۆکەیەت نەداوە لەم ڕۆکەدا. ئەگەر هاوڕێکــەت گوتی بەڵێ.  پرسیاری لێ بکەکەی وبۆچی بــیرت لێ دەکردمەوە؟ئەگــەر لەوکاتــەدا بــیری لێ کردبیتــەوە کــەتۆ بیرۆکەکەت بۆی بەرزکردۆتەوە.ئەگەری هەبووە کە پەیوەندیت  پێوەبکات لەوکاتەدا ئــەوا ســەرکەوتنت  بــەدی هێناوە.هەروەها ئەگەر لەوێدا هیچ بیری لەتۆ نەکردبێتەوە، ئەوا باشترە لێرەدا کەسێکی تــر بــۆ ســەرنج دان ودووبارە کردنەوەی ڕاهێنانەکە لەسەری هەڵ بژێردرێ.

## ڕاهێنانی ژمارە -٢- لەنــاردنـــــی هاوبیری کۆمەڵـــدا

ئەم ڕاهێنانە سادەیە  پێی دەگــوترێ ( چاوپیاخــشاندن ) کەسیك لەژوورێکــدا هەڵبــژێرە بــۆ ئــەوەی جیگــەی تاکیکردنەوەت بێت، بەڵام بەبێ ئەوەی  هەست بەوەبکات. دەشــێ بــەوە هــەڵ بــستیت لەکۆمەڵێکــدا.کــەوابوو کەسێکی نامۆ هەڵدەبژێری ئەوەی لەسەرتە  پێی هەڵدەستی ئەویش ســەرنجدانە لەســەر وێنەیــەکی ڕوون بــۆ ئەوەش ئەو کەسەی کەخەیاڵی لێ دەکەیتەوە بەهێمنی چاوی پێدادەخشێنێ خەیاڵ بکەوە وەکو ئــەوەی پــەریك بێت بەسەر ناوچەیەکدابیخشێنێت.ئەگەر ڕاهێنانەکەت سەرکەوتوبێت، لەوکاتەدا کەسی ناوچەکە خۆی چــاوی پیادەخشێنێ کەلێکدانەوەی بارەکەش لەدەستدانی ئەو کەسەیە بۆ سەربەستی هەڵبژاردنی دەروونی نــاوەوەی کە هەستاوە بەهەڵگرتنی فەرمانەکان کەلێرەدا ئاوەزی هۆشیاری هەموو ئەوەی دێت ودەچێت فەرامۆشی دەکات.

کە نمونەی ئەم کارەش ناشێ کەبکشێتەوە بەهیچ زیانێك لەسەر کەسی ژێرباری تاکیکردنەوەکە....هەوڵی پــێ هەستانی ڕاهێنانەکە بکە لەسەر کەسێکی تر،لەگەڵ گۆرانی بیرۆکەکە وەکو ئەوەی ڕیش گرتن بێــت لــەجیاتی ئەوەی چاوپیاخشاندن بێت هەروەها دەشێ ئەم ڕاهێنانە هەمەجۆر بکرێ لــەماوەی دانــانی بەشــەکانی تــرەوە لەبەدەندا بۆ دەست لێ دانی وهەست پێ کردنی لەلایەن کەسی ژێرباری ئەزمونەوکەوە.

## ڕاهێنـــــــــانی ژماره -٣- لەنـــاردنی هاوبیریدا ( دووکـــــــەس )

بەلە بەرچاوگرتن کەسۆزەکان زۆرتر شـایەنن بـۆ پـەیبردن لەبیرەکانـدا کەئـەویش دیـسان زۆرتـر ئاسـانە لەناردنیدا.هەست پێ کردن ئەو هێزەیە کەلەهەموو جۆرەکاندا ڕەنگ دەداتەوە وکاری تێ دەکرێ...کەهەست پێ کردن جیادەبێتەوە کەبەشێوەی بەردەوام بۆ دەربڕینە لەخۆی بەناو بوونی بەڵگەداردا. ئەم جوڵاندنە سروشتییە بۆ ناردنی هەستەکانی تایبەتە، بەڵام نـەك بـۆ ئەوکەسـەی خۆشـی دەوێ. کەئـەو کاروبارانـەی کەبەهەنـد وەردەگیرێ..هاندان، هورە، سۆز، بەزەیی، بزەو خەندە، گەشـبینی، خۆشەویـستی ، ڕێزگـرتن، خۆنەویـستن، ئومێدە...تـاد. کەدوای ئەوەی کەسی دانانی تاکیکردنەوەکەت هەڵدەبژێری جۆری هەست پێکردنەکە دیاری بکـە کەناردنی دەوێ ئە نجا چاوت دا بخە خەیاڵ دەکەیتەوە لەوێنەی ئەوکەسە لەگەڵ جۆری بەستنەوەی کە پێیـەوە دەبەستریەوە....ئەوە بەروونی ببینە.

ئێستا خەیاڵ بکەوە شێوەیەك بۆ شە پۆلێك ئەو بەستنەوەیە دەبڕێت لەوکاتەی تێیدا جۆرێك لەهەسـتی کـردن دەگوێزرێتەوە دەپێچەسپێنێ وەکو ئەو بارەی لەگەڵ ئەو شە پۆلەدا بەناوزەریادا دەگوێزرێتەوە.

کەڕووی ئەو بەسـتنەوەیەش شـە پۆڵ دەداتـەوە وەکـو وەڵام دانەوەیـەك بـۆ هەسـت پـێ کـردن کەبەناویـدا دەگوێزێتەوە.هەوڵ بدە کەکەسانێك هەڵ بژێریت هەست بە پێویستیان بکەیت بەجۆرەکانی دیاری کراو لەهەست پێ کردن و خواستن بەدیهێنانی هاوسەنگی یە لەژیانیاندا. هەستە لەبارەکانیان بـۆ بنێـرە و بانگیـان بکـە رەفزی بکەنەوە کەئەوەی ئارەزووی دەکەن لەتواناتدایە کەبنێردرێت بەڵام نـەك لەتواناتـدابێت هـیچ کەسـێ ناچاربکەیت لەسەر وەرگرتن...تۆ دەزانی کەکرداری دەرخستن ئازار نادات ، وبەڵکو نیەیـەتی باشـە دەدات تـا بگوێزرێتەوە بۆ کەسی ژێرباری تاکیکردنەوەکە. تێبینی کاتی دەرخستن و بەرزبوونەوە بۆ بیرەکە بکە دوای ئەوە دڵنیابەرەوە لەو کەسەی کەهەست پێکردنی سۆزداری لەگەڵ دایە کەبۆیت ناردووە لەوێدا هەنـدێ لەکەسـەکان هەن ئەوانەی لەتوانایاندا نییە باری سۆزداریان دیاری بکەن کەبەوەشدا هەرگیز لەتواناتدا نابێت کەهەستیان پێ بکرێت کە نێردراویکن لەکەسێکەوە بێ ئومێدنین...بەلکو هەڵ بستە بەتاکیکردنەوەی کەسێکی تر وهەوڵـە کە لەگەڵیدا دووبارە بکەرەوە و بەم ڕاهێنانە هەڵبستە بە پێ ئارەزووەکەت.

## ڕاهێنانی ژمـــاره -٤- لەنـــــاردنی هاوبیری دووکەســــدا

یەکێ لەهاورێکانت هەڵبژێرە تاوەرگربێت وکاتێك دیاری بکە بۆ کارکردن بەیەکەوە پێك بێن لەسەری. کە پێش هــاتنی کــاتی دیــاری کراوبێــت، پێــنج وێنــە کۆبکــەوە کەهەســت بکــەیت لەگــەڵ ڕاهێنانــە کــەدا بگونجێ......بەومانایەی کەهەر وێنەیەك جۆرێك بێت لەهەست پـێ کردنـەکانی تایبـەت لـەلات دوای ئـەوە وێنەیەك هەڵبژێرە لەنێوان ئەو پێنج وێنەیـەدا بـۆ دەسـت پێکردنـی ڕاهێنانەکـە ئـە نجا داوا لەوەرگربکـە کەبەئارامی دابنیشێ وهۆشی ئازادبێت لەهەربیرێك.......کەئەم کەسە لەژوورێکی جیاکراوەدا یان ماڵێکی تردا

